



# منداڵانمان چۆن پێدەگەن؟

## پڕۆگرامێکی پەروەردەیی ئایینییە



نەهرۆ عەلی حەمەد









یەکەم چاپ
هەولێر ٢٠١١

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: منداڵانمان چۆن پێدەگەن ؟

بابەت : پەروەردەی ئایینی

نووسینی : نەهرۆ عەلی حەمەد

نەخشەسازی : کۆمپیوتەری ( هیـوا )

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپ: یەکەم / هەولێر ٢٠١١

چاپخانە :

شوێنی بڵاوکردنەوە: (( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی )) - هەولێر

بۆ کارە هونەرییەکان و چاپکردن ( ٠٧٥٠١١٨١٩١٩ )

بۆ بڵاوکردنەوەو دابەشکرن ( ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ )

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٩)ی ساڵی ( ٢٠١١ ی پێدراوە

# منداڵانمان چۆن پێدەگەن؟

## پرۆگرامێکی پەروەردەیی ئایینییە

نەهرۆ عەلی حەمەد

یەکەم چاپ
هەولێر
٢٠١١

# بەرکۆڵێك

**الحَمْد لله ربُّ العالمين والصلاةُ والسلام على رسول الله...**

منداڵ ئەو توێژە دڵ پاك وناسك و بێ لەکەیە، چۆن ئاراستەی وەرسوڕێنی ئاوا مەدار دەبێ، چۆن نەخشاندنێ لەسینەی بنەخشێنی سەرئجام شوێنەوارێ جێدەمێنێ و لەم سۆنگەوە دەتوانین بڵێین ڕۆڵی دایك و باوك و مامۆستا و ژینگە و دەوروبەر کاریگەریەکی ئەتۆی دەبێ بۆ پەروەردەو پێگەیاندنی، جا دەبێ ئەو دایك وباوك و مامۆستایە زۆر هۆشیارانە و زیرەکانە بنۆڕێ و کارو ڕەفتارێکی وەها نەکات بەدەربێ لەهەر بنەمایەکی پەروەردەیی، دواجار کەسایەتییەکی لاواز و بار بەسەر خەڵك وکۆمەڵگە بەرهەم بێت.

ئایینی ئیسلام بایەخێکی زۆری داوە بەمنداڵ و پەروەردەی منداڵان و ڕێوشوێن و بەرنامەی بۆ داڕشتوە، بۆ وێنە: دوای جەنگی بەدر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) داوای لەو دیلانەکرد کە خوێندەواربوون هەریەکە چەند منداڵێکی موسڵمان فێری خوێندن ونووسین بکات، لە سیاقی ئەمەوە ڕوونە کە خوێندن و زانست و زانیاری بۆ هەموو مرۆڤێ پێویستەو تایبەتتر بۆ منداڵان چونکە

دەرفەتێکی زیاتریان لەپێشە بۆ برەودان بەو ڕەوتە.

لەو ڕوانگەوە بەپێویستم زانی چەند خاڵ و تێبینییەك بخەمە ڕوو لەهەمبەر ئەو کەسانەی کە وەکو چاوساغ ڕۆڵی کارا وکاریگەر و بەرچاو دەبینین لە وتنەوەی ئەم باسەدا:

١- ئەو دایك وباوك ومامۆستایەی وانەکە دەڵێنەوە، پێویستە بەر لەهەر شتێ خۆیان شارەزاییەکی باشیان لە ئەلف و بێیی ئیسلام هەبێ.

٢- ڕەخساندنی کەش وهەوایەکی ئارام وهێمن بۆیان.

٣- گەر لەدوو منالّ زیاتر بوون، هەولّبدرێ، ئەو دایك وباوکە یان مامۆستایەکە، لەبەرامبەریان دانیشێ.

٤- بەڕوویەکی گەش و دوور لە گرژی سەرو سیماو ڕووخسار، بەزەدەخەنەوە وشەکان دەربرێ.

٥- بەر لەوەی دەست بە وتنەوەی وانەکە بکات، سەرەتا سوپاسی خوابکا و سەلاوات بنێرێ بۆ گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)، دواتر دووبارە سلاو لە منداڵانی دانیشتنەکە بکات.

٦- ئەگەر هەر شوێنێك پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەبوو دەبێ بۆیان ڕوونبکاتەوە و هەولّبدات



لەو چوارچێوەو بازنەیەدا دەرنەچێت.

٧- بەر لەهاتنی کاتی وتنەوەی بابەتەکە، دەبێ پێشر گەڵە زانیاریەك کۆبکاتەوە لەهەمبەر ئەو وانەی ئەو ڕۆژە دەیڵێتەوە.

٨- هەر کاتێ ناوی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هات، سەڵاوات بدە لەسەری.

٩- وانەکان کە بەشێوەی پرسیار و وەڵامە، ئێمە لێرەدا بەکورتی چەند پرسیارێکمان نووسیوە، تۆش هەر پرسیارێکت بەمێشك داهات، لێیان بپرسە.

١٠- هەوڵبدە کات دیاری بکەیت، بۆ نموونە: لە پشوی هاویندا، دەکرێ هەموو ڕۆژێ بێ، جگە لە ڕۆژی هەینی، واباشە دوای نوێژی عەسر دەست بەخوێندنی وانەکان بکەیت و ڕەچاوی کات و عەقڵ و ڕادەی بیرکردنەوەی منداڵەکە بکرێت.

١١- سەرجەم وانەکان بریتین لە چواردە وانە، بەپێی ڕیزبەندیەکە بخوێندرێ.

١٢- گەرچی هەندێ وانە بە کەمی لەسەری دواوم، بەپێچەوانەوە، هەندێ وانە درێژترە، هەوڵبدرێ ئەو وانانەی کە زۆرن، بۆ وێنە: لە وانەی یانزەهەم بە چەند ڕۆژێ بە کۆتابێ.

١٣- هەوڵ وکۆشش و بدرێت بۆ ئەوەی منداڵان ئەو بابەتانە لەبەر



بکەن و بۆ ڕۆژی دواتر پێیان بگوترێتەوە(لێیـان بپرسـنەوە) کـارێکی باشە و بەم شێوەیە سەرکەوتن زیاتر بەدەستدێنێ.

١٤- جیاکردنەوەی قوتابیـان بـەوەی ئەگـەر قوتابییـەك بەباشـی وانەکانی بۆ نەخوێندرا، هەوڵبدرێ پەڕاویان بـۆ دابـین بکـرێ یـاخود بەنووسینەوە لەبەری بکەن.

١٥- لـە کۆتـایی هـەر هەفتەیەکدا، تاقیکردنەوەیـەکیان بکـە، بەزارەکی و بەنووسین، دواتر یەکەم و دووەم وسێهەم"ئەگەر ئەم ژمارە هەبوو" دیارییەکی گونجاویان بۆ بسێنەو پێشکەشیان بکە بـۆ ئـەوەی ببێتە هاندەرێك بۆ ئەوانەی کە باش نەیانخوێندووە.

١٦- لەکۆتاییـدا یـەك هەفتـەی تـر تـەرخان بکـە بـۆ دووبـارە پیاچوونەوەی سەرجەمی وانەکان، دواتر تاقیکردنەوەیەکیان لە هەموو نامیلکەکە بۆ سازبکە.

بە ئومێدی سوود گەیاندن بەنەوەی دوارۆژو هەموو ئەوانـەی حـەز دەکەن ڕۆڵەکانیان بەپەروەردەیەکی دروست وئایینی گۆش بکەن.

**لەگەڵ نزاو دوعای خێرم بۆتان**

**دوعای خێرم بۆ بکەن**

**نەهرۆ عەلی ٢٠١٠/٥/٣٠/**

**بەشی یەکەم**

## ئەرك و پایەكانی باوەڕ -الایمان-

١-باوەڕ بەخوا "جل جلاله".

٢- باوەڕ بە فریشتەكانی خوا.

٣- باوەڕ بە كتێبەكانی خوا.

٤- باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوا.

٥- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی.

٦- باوەڕ بە قەزاو قەدەر.

ئەم شەش پایەو ئەركەكانی باوەڕ كە دواتر ئاماژەیان پێدەدەین پێویستە هەموو كەسێ كە خۆی پێ موسڵمانە، بڕوایان پێ بكات و بەڕاستیان بزانێ و گومانی لە هیچیان نەبێت و بە وردی بخوێندرێتەوە.





**وانەی یەکەم**

## باوەڕهێنان بەخوا " جل جلالە"

خوای پەروەردگار ئێمەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، هەموو شتێ خوا بەدیهێناوە، هیچ شتێك نیە كە دروستكراوی خوا نەبێت، خوا ئەو زاتەیە كە كەس هاوبەش وهاوەڵی نیە لە بڕیارو ئیش وكارەكانییدا، كەسی لێ نەبووەو لە كەسیش نەبووە، تاك و تەنهایە، هیچ شتێك هاوشێوەو هاوتای نییە، لە هیچ شتێك ناچێ، دەبینێ و دەبیسێ، ژێنەرو مرێنەرە، ڕزق و ڕۆزیدەری هەموو ژیانلەبەرو گیانلەبەرێكە، بەڕێوەبەرو مشورخۆری ئەم بوون و بوونەوەرەیە، مرۆڤ وپەری تەنها بۆ ئەوەی دروست كردووە تا بەندایەتی و پەرستشی ئەو بكەن، هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیدایە هەموو ملكەچی ئەون، بۆیە پێویستە ئێمەش بیپەرستین و بەندایەتی تەنها بۆ ئەو بكەین، جگە لە خوا شتێكی تر نەپەرستین وجگە لەو، پەرستراوی ترنین كە شایستەی پەرستن و حەوجێی پشت پێ بەستنبێ، هەر ئەویشە جێی نیاز و بێ نیازە.

كەواتە ئەو شتانەی كە فەرمانی پێكردووە پێوەی پابەند دەبین و

جێبەجێی دەکەین، ئەوەشی کە یاساغ وقەدەغەی کردووە، خۆی لێبەدوور دەگرین و وازی لێدێنین، ئەم کارانەشمان تەنها لەبەر ڕەزامەندی ئەوە و پێویستە بە دڵسۆزی و نیەتێکی پاك وساف وبێ هەڵەوپەڵە ئەنجامی بدەین.

**پرسیار: خوا ناوی چیە؟**

وەڵام: ناوی - الله - یە.

**پرسیار: کێ مرۆڤی دروست کردوون؟**

وەڵام: - الله -.

**پرسیار: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە؟**

وەڵام: - الله-.

**پرسیار: کێ چیاو دەشت و دۆڵ و رووبار و دەریاکانی دروست کردووە؟**

وەڵام: - الله -.

**پرسیار: کێ دارستانەکان و باغاتی دروست کردووە؟**

وەڵام: - الله -.

**پرسیار: کێ لە ئاسمان باران دەبارێنێ؟**

وەڵام: - الله -.





**پرسیار: کێ ڕزق و ڕۆزیمان پێ دەبەخشێ؟**

وەڵام: - الله -.

**پرسیار: کێ دەمانژێنێ؟**

وەڵام: - الله -.

**پرسیار: کێ دەمانمرێنێ؟**

وەڵام: - الله -.

کەواتە: خوایەك ئاوا گەورەو بەخشندە و ڕزق و ڕۆزیمان بداتێ و هەموو شتێ لەدەستی ئەو بێت، پێویستە بیپەرستین و لە فەرمانەکانی دەرنەچین، وە خواشمان لەهەموو کەسێ خۆشتر بووێ... لە دایك وباوکیشمان؟ بەڵێ، لە خۆمان و لەدایك وباوك و هەموو کەسێ.

## چیرۆکێك دەربارەی وانەی یەکەم

دەگێڕنەوە ڕۆژێ منداڵێك ڕوو لەدایکی دەکاو دەڵێ: دایکە گیان کێ ئەم جلانەی بۆ دروست کردووم؟ دایکی لەوەڵامدا وتی: بەرگدروو. باشە ، ئەی کێ ئەم مێزەی دروست کردوە؟ دایکی وتی: دارتاش. ئەی کێ ئەم تابلۆیەی دروستکردووە؟ دایکی وتی: وێنەکێش. دایکە یانی ئەم هەموو کەل وپەلانەی بەکاریان دێنین دروست کراوی مرۆڤە؟ بەڵێ ڕۆڵە. ئەی کەوایە کێ مرۆڤی دروست کردوە؟ دایکی وتی: خوای پەروەردگار، کە هەموو بوون و بونەوەر و ئاسمانەکان وزەوی و ئەوەی لە نێویدایە هەموو دروستکراوی ئەوە ، بۆیە پێویستە تەنها خوا بپەرستین.

* * *





## وانەی دووەم

# باوەڕ بەفریشتەکانی خوا

زانیمان هەموو شتێ خوا دروستی کردووە، هەر لە ڕێزی ئەم دروستکراوانە، بەهەمان شێوەو جۆر کە فریشتەکانن ئەوانیش دروستکراوی خوان لە ڕووناکی - نوور- دروستکراون و هیچ هەڵەناکەن وهەموو سات لەخزمەت جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگارن و تەنها بۆ ساتێکیش ناوەستن، هەمیشە خەریکی خواپەرستین و نە دەخۆن و نەدەخۆنەوەو نە دەخەون و شێوەو قەبارەیان زل وگەورەن، زۆر بەهێزن، باڵدارن، لایەنی زایەندیان نیەو زۆریش جوانن.

**پرسیار: -الملائکە- واتا چی؟**

وەڵام: فریشتە.

**پرسیار: فریشتەکان لەچی دروستکراون؟**

وەڵام: لە ڕووناکی - نور-.

**پرسیار: ئێمە دەتوانین بیانبینین؟**

وەڵام: نەخێر، بەڵام پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دوو جار جبریلی لەسەر شێوەی خۆی بینیوە.

**پرسیار: نێر و مێیان هەیە؟**

وەڵام: نەخێر، هەر خوا خۆی دەیزانێ چۆنن.

**پرسیار: فریشتەکان بێزار و ماندوو دەبن؟**

وەڵام: نەخێر، زۆر گورج وگۆڵن.

**پرسیار: شوێنیان بە زۆری لە کوێیە؟**

وەڵام: بەزۆری لە ئاسمانەکانن.

**پرسیار: کار و پیشەیان چییە؟**

وەڵام: هەمیشە خەریکی خواپەرستین و لە خزمەت بڕیارو فەرمانەکانی خوادان" جل جلاله".

**پرسیار: دەتوانن بچنە سەر شێوە و دیمەنی جیا؟**

وەڵام: بەڵێ دەتوانن، وەك لە بەسەر هاتی حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)کاتێ دەڵێن: دەچین بۆلای گەلی حەزرەتی **لوط** (علیه السلام) کە لەسەر شێوەی چەند گەنجێکی جوان دەرکەوتن، یان لەسەردەمی **پێغەمبەر لەسەر شێوەی هاوەڵێك کە(دحیە) بینیویەتی.**





**پرسیار: ژمارەی فریشتەکان چەندە؟**

وەڵام: ژمارەیان بێشمارە و زۆرن تەنها خوا دەزانێ.

**پرسیار: فریشتەکان ناویان هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، ناویان زۆرن، بەڵام ئەوەی ئێمە دەیانزانین ئەوانەن کە خوای پەروەردگار لە قورئان و لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا پێمان گەیشتووە وەك:

**( جبریل، میکال یا میکائیل، ئیسرافیل، مالك، رضوان، المنکر والنکیر، هاروت وماروت، ملك الموت، رقیب وعتید).**

**پرسیار: ئەمانەی ناومان هێنان کاریان هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، هەر یەك لەمانە کاری تایبەتی خۆیان هەیە.

**پرسیار: کارەکانیان چیە؟**

وەڵام: بۆ هەر یەك لەمانە دەتوانین بەکورتی کارەکانیان بخەینە ڕوو:

**١-جبریل: پەیام هێنەری خوایە بۆ پێغەمبەران، واتە: بەفەرمانی خودا نیگایان بۆ دێنێ.**

**٢-میکال یان میکائیل: سەرپەرشتی ڕووەك و باران و ئاو دەکات، بەو واتایە سەرپەرشتی ڕزق و ڕۆزی دەکات.**

**٣- ئیسرافیل: فوو بە کەڕەنا-صور- دا دەکا، دنیا تەخت و پەخشان دەکات، دوو فوو دەکات:**

یەکەم: هەموو بوون بەسەریەکدا تێکدەچێت‌ودنیاشی لەگەڵدا وێران دەبێ.
دووەم: هەموو ئەوانەی کە مردوون، زیندوو دەبنەوە.
٤-مالك: دەرگەوانی دۆزەخە و سەرپەرشتی ئاگری بەسۆی دۆزەخ دەکات.

٥-رضوان: دەرگەوانی بەهەشتە، سەرپەرشتی بەهەشت دەکات.
٦-٧-مونکەر و نەکیر: ئەمانە تایبەتن بەپرسیارلێکردنی هەر کەسێك کە دەمرێ و دەخرێتەگۆڕەوە.
٨-٩-هاروت وماروت: ئەو دوو فریشتەن کە بەفەرمانی خوا لە بابل دابەزییون بۆ ئەوەی خەڵك فێری جادوو-سحر- بکەن بۆ تاقیکردنەوە، هیچ کەسیان فێرنەدەکرد، مەگەر لەپێشەوە پێیان دەگوت: بۆ تاقیکردنەوەیە و خۆت فێرمەکە و فێرمەبە، هەڵبەت دیارە هەر کەسێ پێداگریکردبێ لەسەر ئەوەی هەر دەبێ فێریان بکەی، فێریان کردوون، بەڵام بەم فێربوونەیان خۆیان پێ "بێ بڕوا" کردووە.
١٠-ملك الموت: گیانکێشی دروستکراوەکانی لەدەستە، گیانی هەموروان دەکێشێ.

* رەقیب و عەتید: کاروکردەوەی چاك وخراپی مرۆڤ دەنووسن، لەسەر لای ڕاست و چەپی مرۆڤن، بەڵام ئەم دوو ناوە کە سیفەتیانە، چاودێرو ئامادەن بەسەر مرۆڤەوە.



## چیرۆکێك دەربارەی وانەی دووەم

ڕۆژێ منداڵێك بەتەنها دادەنیشێ و بیردەکاتەوە، لەو کاتەدا هاوڕێیەکی دڵسۆز دەبێتە میوانی، دوای سڵاو کردن، قسە دەکەن و ئەم منداڵە قسەیەکی خراپ بەدەمیەوە دێت، هاوڕێ دڵسۆزەکەی ئامۆژگاری دەکات و پێی دەڵێ: چیتر قسەی ئاوا مەکە، منداڵەکەش دەڵێ: خۆ فلانەکەس لێرە نیە تاگوێی لێبێت، هاوڕێ دڵسۆزەکەی دەڵێ: ئەی بۆ نازانی کە خوا بەئاگایە لەهەموو شتێ؟ تەنانەت دوو فریشتە هەموو سات لەگەڵمانن هەر ورتە و قسەیەك لە زمانمان بێتەدەر ئەوا یەکسەر دەینووسن، بۆیە هەوڵبدە تەنها قسەی باش بکەین. منداڵەکە زۆر هەستی بەپەشیمانی کردو بڕیاریدا چیتر لەلای هاوڕێیانی و بەتەنهاش بێت قسەی خراپ نەکات.

## وانەی سێیەم

## باوەڕ بەکتێبەکانی خوا

هەر میللەت وگەل ونەتەوەیەك بە درێژایی مێژوو لەسەر ئەم زەویە ژیابێ و گوزەری کردبێ، خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، جا لە نێو ئەم پێغەمبەرانە هەبووە کتێبی بۆ ناردوون، کەواتە ئێمە باوەڕمان بە هەموو کتێبە ئاسمانیەکان هەیە، بەتایبەت بۆ دوا ئومەت کتێبێ نێردراوە کە ئەویش قورئانە، قورئانیش درێژەپێدەری کتێبەکانی ترە و ڕاستکەرەوەشیانە.

بۆیە پێویستە هەموو مرۆڤایەتی باوەڕی پێبێنێ و شوێنکەوتەی بێ، جگە لە قورئان کتێبەکانی تر بەڕاست نازانین چونکە دەستکاری کراونو وشەکانیان گۆڕیونو بەپێی حەزو ئارەزووی خۆیان دەستیان تێئەخنینە، لە بنەڕەتدا حەق بوونو لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دابەزیون بۆسەر پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسەربێ) بەڵام دواتر شێوێنراون، بۆیە ئەوانەی شێوانراوە بەڕاستی نازانین، کە لەم سەردەمەدا بەرجەستەیە..کتێبەکانی پێشوو بەر لەقورئان تایبەت



بووە بە ناوچە و گەل و جوغزێ، بەپێچەوانەوە قورئان بەر لەهەموو شتێ خوا خۆی پەیمانی داوە بەپارستنی و هەر خۆی دەیپارێزێ، قورئان شێوەیەکی گشتگیری لەخۆگرتووە و بۆ هەموو سات ودەم و کاتێ لەجێیە و حەوجێ بەشوێنکەوتنیەتی کە مرۆڤ شوێنی بکەوێ و باوەڕی پێبێنێ.

**پرسیار: ئەم کتێبانە بەهۆی کێ نێردراون؟**

وەڵام: بەهۆی جبریل(علیه السلام).

**پرسیار: ئەم کتێبانە ژمارەیان چەندە؟**

وەڵام: ژمارەیان زۆرە، وەك لە ئەسەرێکدا هاتووە "١٠٤" سەدوچوار نامەی ناردووە.

**پرسیار: ئەم کتێبانە ناویان هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، ئاماژە بەناوی پێنج لەم کتێبانە دراوە.

**پرسیار: ناوی ئەم کتێبانە چیە؟**

وەڵام: ناویان (صحف، التوراة، الزبور، الانجیل، القران).

**پرسیار: ئەم کتێبانە بۆ کام لە پێغەمبەران هاتوون؟**

وەڵام: لە قورئانی پیرۆز خاوەنی ئەم کتێبانە نیشاندراوە، وەك:

١-صحف- بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام).

٢-تەورات- بۆ پێغەمبەر مووسا (علیه السلام).



٣-زەبوور- بۆ پێغەمبەر داوود(عليه السلام).

٤-ئینجیل- بۆ پێغەمبەر عیسا(عليه السلام).

٥-قورئان- بۆ پێغەمبەرمان "موحەممەد"(صلى الله عليه وسلم).

**پرسیار: کام کتێب لەمانە بۆ دوایین ئوممەتە؟**

وەڵام: قورئانی پیرۆز.

**پرسیار: قورئانی پیرۆز بۆ کام پێغەمبەر نێردراوە؟**

وەڵام: موحەممەد (صلى الله عليه وسلم).

**پرسیار: قورئان جگە لە ناوی خۆی، ناوی تری هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، زۆر ناوی تری هەیە.

**پرسیار: ئەو ناوانە چین؟**

وەڵام: بریتین لە:

١-فورقان.

٢-الكتاب.

٣-ذکر.

**پرسیار: قورئان چەند بەش-جزء- ە ؟**

وەڵام: سی(٣٠) جوزئە.

**پرسیار: چەند سورەتە؟**

وەڵام: ١١٤ سەدو چواردە سورەتە.



**پرسیار: قورئان چەند ئایەتە؟**

وەڵام: ٦٢٣٦شەش هەزارو دوو سەدو سی وشەش.

**پرسیار: قورئان بە چ سورەتێك دەست پێدەكات و بەچی كۆتایی دێت؟**

وەڵام: بەسورەتی (الفاتحە) ەوە دەست پێدەكات و بە سورەتی (الناس) بە كۆتا دێت.

**پرسیار: قورئان بەچەندقۆناغ دابەزیوە؟**

وەڵام: قورئان سێ دابەزینی بەخۆوە بینیوە:

١-لەزاتی خواوە دابەزیوەتە سەر" **لوح المحفوظ**".

٢-لە" **لوح المحفوظ**" ەوە هێنراوە بۆئاسمانی یەكەمی دنیا كە پێی دەڵێن" **بیت العزة**".

٣-لە " **بیت العزة**" ەوە بۆسەر دڵ ودەروونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

**پرسیار: هەموو قورئان بەجارێ بۆ سەر دڵ و دەروونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)دابەزیوە؟**

وەڵام: نەخێر، بەشێوەی پچرپچڕ و هەر جارەی چەند ئایەت یان سورەتی بۆ هێنراوە لەلایەن جبریلەوە.

**پرسیار: قورئان بەچەند قۆناغ كۆكراوەتەوە؟**

وەڵام: بە چوار قۆناغ:

١-قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

٢-قۆناغی سەردەمی ئەبوبەکر(ڕەزای خوای لەسەر بێ).

٣-قۆناغی سەردەمی عوسمان(ڕەزای خوای لەسەر بێ).

٤-قۆناغەکانی سەردەمی دوای عوسمان(ڕەزای خوای لەسەر بێ).

**پرسیار: قورئانی قۆناغی مەککی و مەدەنی یانی چی؟**

وەڵام: ئەو سورەت و ئایەتانەی کە لەشاری مەککە هاتونەتە خوارێ ئەوە پێی دەڵێن ئایەت یا سورەتی مەککی، وە ئەوەشی لە دوای کۆچکردن بۆ شاری مەدینە ئەوە پێی دەڵێن مەدەنی.

## چیرۆکێك دەربارەی وانەی سێیەم

**ڕۆژێکیان ئازاد لەباوکی پرسی: باوکە ئێمە وەکو ئیسلام تەنها باوەڕمان بەقورئان هەیە؟ لەوەڵامدا باوکی وتی: ڕۆڵەگیان ئایینی ئیسلام جگە لەقورئانی پیرۆز باوەڕی بەهەموو ئەو کتێبانە هەیە کە لە لای خوای پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەرانی ناردووە، بەڵام چونکە ئەو کتێبانە لەلایەن مرۆڤەوە دەستکاری کراون و گۆڕدراون و گوایە لەلایەن خواوە هاتۆتە خوارێ بۆیە دەبێ لەژیانماندا تەنها باوەڕ بەو کتێبانە بێنین کە ئەویش قورئانی پیرۆزە.**



## وانەی چوارەم

# باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوا

باوەڕ بەپێغەمبەران لەسەر هەموومان پێویستە بە بێ هەڵاوێرکردن و بێ جیاوازی کردن "فرق" لە نێوانیان، پێغەمبەران ئەوانەن کە خوا لە نێو مەردوم هەڵیبژاردوون و فریشتە نین بەڵکو مرۆڤن، بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك خوای پەروەردگار نێردراوێکی بۆ ناردوون، بۆ ئەوەی ئەم پەیام و شەریعەتەی کە خوا ناردویێتی، بە خەڵکی بگەیەنن، بانگیانکردوون بۆ یەکتایی خوا، خەڵکیان کردوە بەبەندەی خوا، خەڵکیان دەرێناوە لە بت پەرستیەوە بۆ خواپەرستی، لەشەخص پەرستیەوە بۆ بەندایەتی خوا، بڕیار و فەرمانەکانیان گەیاندوە تا چاك وخراپ لێك جوێ بکرێتەوە، بەرچاو ڕوون بوونە بۆ خەڵکی لەکاتێ مرۆڤایەتی بەیەك چاو لە زەلکاوی نەزانی و پێداگریان دەیاننۆڕی، حەرام وحەلاڵیان لێك جیا نەدەکردەوە.

پێغەمبەران هەواڵیان دەدا کە ئەم ژیانە ژیانی راستەقینە نیە و جگە لەم ژینە ژیانێکی تر هەیە، مرۆڤ بەرهەمی خۆی دەدروێتەوە، تێیدا پاداشت و سزا لەهەمبەر چاکەی چاکەکاران و خراپەی خراپەکاران و سەرکەشان وەردەگرێ.





پێغەمبەران وەڵامی ئەو پرسیارانەیان بۆ خەڵك ڕوونكردۆتەوە كە لە بیر و هزریان دەخولایەوە، لەتەكدا برو و بیانو "حجە" یان دەبڕین تا سەرنجام و لە كۆتایی دنیادا گلەیی وگازندە و سكاڵا نەكەن بەوەی نەیاندەزانی، بۆ وێنە: خوا كێیە؟ سیفەتەكانی چین؟ ئەم بوونە بۆچی دروستكراوە؟ فریشتەكان كێن؟ جنۆكەو شەیتانەكان كێن؟ مرۆڤ بۆ دروست بووە؟ ئەركی سەرشانی چین و بۆچی هاتوون؟ چی بكا، سەرنجام بەكوێ دەگات؟.

پێغەمبەران سەرمەشق و مامۆستا و پێشڕە و بوونە بۆ خەڵكی، لەگەڵ ئەمەشدا خەڵكیان دەرێناوە لە نەزانینەوە بۆ زانین، بۆ پەروەردەكردن و ڕێكخستنی مەردووم بۆ ئەوەی مرۆڤانە بژیێن، كەس زوڵم و ستەم لەكەس نەكا، كەس كەس نەخاتە ژێر ڕكێف و ژێردەستەی نەكاو نەیچەوسێنێتەوە، كەس نەبێتە بەندەی كەس، بەڵكو خەڵك بكەنە بەندەی خوا، بۆ ئەوەی مرۆڤ لە بنەبانی چراڕەشكەی نابووت دەربێنێ، هەنگاو هەڵگرێ بەرەو نوورو ڕووناكی و هەقیقەت.

**پرسیار: پێغەمبەران چی بوون؟**

وەڵام: مرۆڤ بوون و لە ڕەگەزی نێرینە بوون.

**پرسیار: هیچ پێغەمبەرێك هەیە ئافرەت بووبێ؟**

وەڵام: نەخێر.

**پرسیار: چ شتێ لەنێوان پێغەمبەران بەدیدەکرێت؟**

وەڵام: هەندێ شت بەدی دەکرێ وەك: هەندێکیان (رسول)ن ، هەندێکیان (نبی) ن.

**پرسیار: مەبەست لە (رسول) یانی چی؟**

وەڵام:"ڕەسول" ئەو کەسەیە کە خوای پەروەردگار نیگای بۆ دەنێرێ، لەسەریشی پێویست دەکات کە بانگەوازبکا و بەخەڵکی بگەیەنێ، شەریعەت و بەرنامەیەکی سەربەخۆ و تازەی پێیە.

**پرسیار: مەبەست لە (نبی) یانی چی؟**

وەڵام : "نەبی" ئەو کەسەیە کە خوای پەروەردگار وەحی بۆ دەنێرێ و بەخەڵکیشی ڕادەگەیەنێت، بەڵام لەسەر شەریعەت و بەرنامەی پێغەمبەری پێش خۆی دەڕوات و درێژە پێدەریەتی.

**پرسیار: ژمارەی پێغەمبەران چەندە؟**

وەڵام: ١٢٤٠٠٠ سەدوبیست وچوار هەزار پێغەمبەرە.

**پرسیار: لەم ژمارەیەدا چەندیان (رسول)ن.**

وەڵام: ٣١٥ سێ سەد و پانزەیان ڕەوانەکراو-مرسل-ن.

**پرسیار: ژمارەی (نبی) چەندە؟**

وەڵام: ١٢٣٦٨٥سەد و بیست و سێ هەزار و شەش سەد و هەشتا



و پێنجیان -نبی-ن.

**پرسیار: لەم ژمارەیە ناوی چەندیان لە قورئان هاتووە؟**

وەڵام: لە قورئانی قسەلەجێ ٢٥ بیست وپێنج پێغەمبەر ناویان هاتووە.

**پرسیار: ناوەکان کێن؟**

وەڵام: لەسورەتی الانعام- لەئایەتی ٨٣تا٨٦/ ناوی ١٨هەژدە پێغەمبەر بەڕیز هاتووە، ئەوانی تر بەجیا لە ئایەتەکانی تر هاتوون، لەم ڕێزبەندیە دەیخەینە ڕوو:

پێغەمبەر ئادەم (علیه السلام).

پێغەمبەر ئیدریس (علیه السلام).

پێغەمبەر نووح (علیه السلام).

پێغەمبەر هوود (علیه السلام).

پێغەمبەر صالح (علیه السلام).

پێغەمبەر شوعەیب (علیه السلام).

پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام).

پێغەمبەر لووط (علیه السلام).

پێغەمبەر ئیسماعیل (علیه السلام).

پێغەمبەر ئیسحاق (علیه السلام).



پێغەمبەر یەعقووب (علیه السلام).

پێغەمبەر یووسف (علیه السلام).

پێغەمبەر موسی (علیه السلام).

پێغەمبەر هاروون (علیه السلام).

پێغەمبەر یوونس (علیه السلام).

پێغەمبەر ئەییوب (علیه السلام).

پێغەمبەر ئەلیەسەع (علیه السلام).

پێغەمبەر ذو لکیفل (علیه السلام).

پێغەمبەر داوود (علیه السلام).

پێغەمبەر سولەیمان (علیه السلام).

پێغەمبەر ئیلیاس(علیه السلام).

پێغەمبەر زەکەرییا (علیه السلام).

پێغەمبەریەحیا (علیه السلام).

پێغەمبەر عیسا (علیه السلام).

پێغەمبەرموحەممەد (علیه السلام).



**پرسیار: كۆتا پێغەمبەر كامەیە؟**

وەڵام: پێشەوای مرۆڤایەتی (موحەمەد المصطفی) یە.

**پرسیار: دوای پێغەمبەرمان موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) هیچ پێغەمبەرێكی تر دێت؟**

وەڵام: نەخێر، چونكە پێغەمبەرمان موحەمەد(صلی الله علیه وسلم) دواین وكۆتایی هەموو پێغەمبەرانە.

**پرسیار: بەرزو بەرزترین لەنێو پێغەمبەران هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، خوای پەروەردگار ئەو ڕەوانەكراوانەی هەندێكیانی بەسەر هەندێك بەرز كردۆتەوە.هەر وەكو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز، لە سوورەتی(البقرە)ئایەتی(٢٥٣)دەفەرموێ: ﴿تلك الرسل فَضلَنا بَعضَهُم علی بَعض﴾ واتە: ﴿لەو پێغەمبەرانە رێزمان داوە بە هەندێكیان بەسەر هەندێكیاندا﴾

**پرسیار: خاوەن عەزمەكان -اولو العزم- كێن؟**

وەڵام: (٥) پێنجن، ئەمانەن: (نووح، إبراهیم، مُوسی، عیسی، محمد).

**پرسیار: كام لەپێغەمبەران پلە و پایەی بەرزترە و لەسەرەوەی هەموویانە؟**

وەڵام: پێشەوای مرۆڤایەتی كە (موحەمەد المصطفی(ص)) یە.





**پرسیار: بنەماکانی کەسایەتی پێغەمبەران کامانەن؟**

وەڵام: زۆر بنەما هەیە بۆ وێنە:

١-پێغەمبەران مرۆڤ بوونە، نەفریشتە بوونە نە غەیری فریشتە، بەڵام وەحیان بۆ هاتووە.

٢-پێغەمبەران هەموویان پیاو بوونە هیچ کام لەوانە ئافرەت نەبووە.

٣-پێغەمبەران لە گوناهە گەورەکان ولەگوناهی بچووکیش پارێزراو (معصوم) ن، خوای پەروەردگار پاراستوونی لەپێش پێغەمبەرایەتی و دوای پێغەمبەرایەتی.

٤- پێغەمبەران لەڕووی جەستەو خورەوشت و فیترەت پاك و تەواوترین وچاکترینی مرۆڤن، خاوەنی بیرو عەقڵێکی گەورەن.

٥-پێغەمبەران لەسەر مەرگ سەرپشککراون حەز بەمانەوەدەکەن لەدوونیا، یان گەرەکیانە بمرن وبگەڕێنەوە بۆ لای خوا"جل جلالە"، دیارە کە زانیویانە کاتی مردنیان هاتووە داوای گەڕانەوەیان کردووە بۆلای خوای پەروەردگار، گەرچی ئیختیاریان پێدراوە.

٦-پێغەمبەران بەلاشە وچاویان خەویان لێکەوتووە، بەڵام دڵیان هۆشیارو بێدارە.

٧-لەهەر شوێنێك وەفاتیان کردبێت، هەر لەو شوێن وجێگایەدا



نێژراون.

٨- زەوی جەستەی پێغەمبەران ناخوات و ناڕزێنێ.

٩-پێغەمبەران لە گۆڕەکانیاندا زیندوون، لەگۆڕەکانیاندا نوێژدەکەن.

## چیرۆکێك دەربارەی وانەی چوارەم

رۆژێکیان چرۆ لەدایکی پرسی: دایەگیان ئایا جگە لە پێغەمبەر موحەممەده (درودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەری دیکەمان هەیە؟ دایکی لەوەڵامدا وتی: بەڵێ، ئێمە کەموسڵمانین بەپێی فەرمایشتەکانی خوای پەروەردگار باوەڕمان بەهەموو ئەو پێغەمبەرانە هەیە کەلای خوای کاربەجێوە بۆ سەر مرۆڤایەتی نێردراون و هەموویان بەیەك چاو سەیر دەکەین، هەر لە پێغەمبەر ئادەمەوە تا دوایین پێغەمبەر کە موحەممەده (درودی خوای لەسەربێ).

* * *



## وانەی پێنجەم

## باوەڕکردن بەڕۆژی دوایی

باوەڕ بەرۆژی دوایی یەکێکە لەو پایانەی کە هیچ گومانی تێدانیە ڕۆژێ دادێ ئەم ژیانی دنیایە بە کۆتادێت و لە ژیانێکی تر خۆمان دەدۆزینەوە، وە مرۆڤ دروستکراوێکی تاك وناوازەیە لە نێو دروستکراوەکانی، خوای پەروەردگار رێزی لێناوەو وە زەوی و ئاسمانەکانی بۆ ڕام کردووەو لەخزمەتی ئەودا درووستی کردووە، کەواتە شتێکی ناشایستەیە تەنها شەست حەفتا ساڵێ لەتەمەنی بوەشێتەوەو ئەوەندەی پێڕەوا ببینرێ، دیارە کەمرۆڤیش بێ هودە دروستنەکراوە، لەهەمبەر ئەو کاروکردەوانەی ئەنجامیدەدات جا چ چاکەو چ خراپە لێپێچینەوەی ولێپرسینەوەی دەگەڵ دەکرێ، بەوەی تا چ ئەندازەیەك پابەند بووە بەبەرنامەو شەریعەتی خواوە، دیارە ژیانی ئەم دنیا تەنها شوێنی تاقیکردنەوەیەو مەیدانی پیادەکردنی کردەوەکانە، شوێنی چاندن وڕواندنە، بەرهەم ودروێنە لە ئەوێ رۆژێیە کە رۆژی دواییە.

بێ گومان رۆژی دوایی هەر دێت بەڵام ئێمە نازانین کاتەکەی کەیە، وە گەلێ نیشانە هەیە، بۆ نزیك بوونەوەی رۆژی دوایی، بەڵام




هەر کاتێ مرۆڤ بمرێ قیامەتی لێ هەڵدەستێ، بەو واتایەی ئەگەر ژیانی نێو گۆڕی زەحمەت و بەئازاربێ، چاڵێك بێ لەچاڵەکانی دۆزەخ، ئەمەش ژیانی بەرزەخە.

**پرسیار: مرۆڤ لە ژیان بەچەند قۆناغ تێدەپەڕێت؟**

وەڵام: چوار قۆناغ:

١-قۆناغی نێو سکی دایکی.

٢-قۆناغی ژیانی دنیا.

٣-قۆناغی نێو گۆڕو بەرزەخ.

٤-قۆناغی رۆژی دوایی گۆڕەپانی لێپێچینەوە.

**پرسیار: کەی رۆژی دوایی دێت؟**

وەڵام: کەس نازانێت جگە لەخوا.

**پرسیار: رۆژیی دوایی چەند ناوی هەیە؟**

**وەڵام: لە قورئانی پیرۆز زۆر ناوی هاتووە، وەك:**

**١-الیوم الاخر یان الدرالاخرە...** " رۆژی دوایی".

**٢-القیامة...**"رۆژی هەستانەوە".

**٣-یوم البعث...**" رۆژی زیندووبونەوە".

**٤-الساعة...**"کاتێکی دیاریکراو".

**٥-یوم الخروج...**"رۆژی دەرچوون و چوونەدەر".



٦-يوم الدين..."ڕۆژی سزاو پاداشت".

٧-يوم الفصل..."ڕۆژی لەیەك جیاكردنەوە، یان دادگاییكردن".

٨-يوم الحساب..."ڕۆژی لێپرسینەوە".

٩-يوم الجمع..."ڕۆژی كۆكردنەوە".

١٠-يوم الآزِفة..."ڕۆژی نزیك".

١١-يوم الوعيد..."ڕۆژی هەڕەشەو ترساندن".

١٢-يوم الخلود..." ڕۆژی هەمیشەمانەوە".

١٣-يوم الحسرة..."ڕۆژی پەشیمانی".

١٤-يوم التلاق..."بەیەكگەیشتن".

١٥-يوم التَنَاد..."ڕۆژی یەكتر بانگكردن".

١٦-يوم التغابُن..."ڕۆژی زەرەرلەیەكتردان".

١٧-الواقعة..."ئەو ڕۆژەی كە ڕوودەدات".

١٨-القارعة..."دەنگێكی داچڵەكێنەرو شڵەژێنەر".

١٩-الحاقة..."ئەو ڕۆژەی كە هەقی تێدادەچەسپێ"

٢٠-الطامَة الكبرى..."كارەساتێكی گەورە، كەهەموو شوێنێ دەگرێتەوە".

٢١-الصاخَة..."دەنگێكی بەهێز، گوێیەكان كەڕ دەكات".

٢٢-الغاشية..."داپۆشەر".



**پرسیار: لە رۆژی دوایی چی روودەدات؟**

وەڵام: فوو بەکەڕەنادەکرێ؟ جاری یەکەم هەموو بوونەوەر بەسەر یەکتر دادەتەپێ و هەرچی لە ئاسمان وزەویدان لە هۆش خۆیان دەچن ودەمرن، دووەم قۆناغ، هەرچی زیندووبووە زیندوو دەکرێتەوە لە گۆڕەپانی کۆکردنەوەو لێپرسینەوە ڕادەوەستن.

**پرسیار: لەرۆژی دوای چین ئەوانەی کۆدەکرێنەوە؟**

وەڵام: مرۆڤ و فریشتە و جنۆکە و ئاژەڵ دوای زیندوبوونەوە و هەستانەوە هەموویان کۆدەبنەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێ.

**پرسیار: بێ باوەڕەکان چیان لیٚ دێ لەم رۆژەدا؟**

وەڵام: دڵیان دەکەوێتە لەرزوو چاویان ئەبڵەق دەبێت.

**پرسیار: دوای وەستان ولەرزان چی ڕوو دەدات؟**

وەڵام: تەرازوی دادگەری خوا دەهێنرێ بۆ کێشانی کاری چاکەوخراپەی مرۆڤ، وە وەرگرتنەوەی لیستی کاروکردەوەکان، ئەوەی بڕواداری چاکەکارە، بەدەستی ڕاست وەریدەگرێ، ئەوەیش بێ بڕواو تاوانبارە بەدەستی چەپە وەریدەگرێ، دواتر بەهەشت دەڕازێنرێتەوە و دۆزەخیش ئاگرەکەی هەڵدەگیرسێنرێت.

**پرسیار: دواتر بەرەو کوێ دەڕۆن؟**

وەڵام: هەموو مرۆڤەکان بەرێدەکەون بۆ پەڕینەوەیان بەسەر پردی





سەرپشتی دۆزەخ.

**پرسیار: بۆچی بەسەر پشتی ئەم پردە تێدەپەڕن؟**

وەڵام: تاوەکو ئەوەی بێ باوەڕە و تاوانبارە بکەوێتە نێویەوە و بچێتە خوارەوە، بەپێچەوانەوە بڕواداران وپارێزکاران دەپەڕنەوەو رزگاردەبن لە ئاگری ناسۆری بەتینی دۆزەخ.

**پرسیار: لەم رۆژە خەڵك جل و پۆشاکیان لەبەردایە؟**

وەڵام: نەخێر، خەڵکی هەموو ڕووتن بەپێخواسی و بە سوننەت نەکراوین، چۆن لەدایك دەبن ئاوان.

**پرسیار: تیشکی رۆژ چەند لە خەڵکەوە نزیکە؟**

وەڵام: بەئەندازەیەکی زۆر کەم، نزیکی میلێك.

**پرسیار: میلێك چەندە؟**

وەڵام: نزیکەی ١٦٠٩هەزارو شەش سەدو نۆ مەترە.

**پرسیار: تین و تاوی تیشکی ڕۆژ چ کاریگەریەکی هەیە؟**

وەڵام: خەڵکی بە ئەندازەی زۆری و کەمی تاوانەکانی دەکەونە نێو گەرمی وئارەقەی لەشیانەوە.

**پرسیار: هیچ پەناگە و سایە و سابات و سێبەرێك هەیە لەم ڕۆژەدا؟**

وەڵام: بەڵێ.



**پرسیار: کێن ئەوانەی لەژێر ئەو سێبەرەدان؟**

وەڵام: حەوت چینن:

١-سەرۆك وئیمامێکی دادگەر.

٢-گەنجێك فرچکی بەپەرستنی خواوە گرتووە.

٣-پیاوێك کە دڵی بەمزگەوتەوە بەندە.

٤-دووپیاو لە پێناوی خوادا یەکتریان خۆشویستووە، هەر لەسەر خۆشویستنی خوا کۆدەبنەوە، هەر بەو خۆشەویستیەوە لێك جیادەبنەوە.

٥-پیاوێك کە ئافرەتێکی خاوەن پایەو جوان بانگی دەکات(بۆداوێن پیسی) ئەویش دەڵێ: من لەخوا دەترسم.

٦-پیاوێك کە خێرێك دەکات هێندە بەپەنهانی دەیکات کە ئەگەر لای راستی بیبەخشێ لای چەپی پێی نازانێت.

٧-پیاوێك کە بەتەنها یادی خوا دەکاتەوە و چاوی پڕدەبن لەئاو(مەبەست گریان وفرمێسك ڕشتنە).

**تێبینی: هەر وەکو زانایان دەفەرموون ئەو سیفەتانە تایبەت نین بە پیاوانەوە، بۆ ئافرەتانیشە**





**پرسیار: لەم رۆژە هیچ کردەوەیەك بزردەبێ؟**

وەڵام: نەخێر، تەنانەت بە قەد قورسایی گەردیلەیەك چاکەو خراپەت کردبێ دەیبینیتەوە.

**پرسیار: کێ لەم رۆژە بەهاناي کێ دێت؟**

وەڵام: کەس بەهاناي کەسەوە ناهێت، مەگەر خوا لێت خۆشبێ و شەفاعەت و تکای پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم).

**پرسیار: ژیانی ناو گۆڕ چیە؟**

وەڵام: دوای ئەوەی مرۆڤ دەمرێ، قۆناغی نێو گۆڕ دەست پێ دەکات، دوو فریشتە پرسیاری لێدەکەن، ئەگەر باوەڕداربێت نازونیعەمەتی تێدایە بۆ ئەو، بۆ بێ بڕواو تاوانبارو خراپەکاریش ئەشکەنجەو ئازاری تێدایە.

**پرسیار: پرسیارەکانی ناو گۆڕ چین؟**

وەڵام:

١-خوای تۆ کێیە؟

٢-ئایینت چیە؟

٣-ئەو پیاوەی ناردرا بوو بۆ لای ئێوە کێ بوو؟

**پرسیار: وەڵامی ئەم پرسیارانە چین؟**

وەڵام:





١- خوای پەروەردگارە — الله-یە.

٢-ئایینی ئیسلامە.

٣-موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم) کە رەوانەکراو و پێغەمبەری خوابوو .

**پرسیار: نیشانەکانی رۆژی دوایی چین؟**

وەڵام: زۆر نیشانەی هەیە کە دەکرێن بەچوار بەشەوە:

**یەکەم: ئەو نیشانانەی روویانداوەو تێپەڕیوون، وەك:**

١-هاتنی پێغەمبەری کۆتا ژیان(صلی الله علیه وسلم).

٢-لەتبوونی مانگ.

٣-دەرچوونی ئاگرەکەی حیجاز، کە لە شاری بوسڕا روونـاکی وبلێسەی دەرکەوت.

٤-نەمانی سەرانەو خەراج.

**دووەم: ئەو نیشانانەی کە ڕابردوو و ڕوویانداوەو ئێستاش بەردەوامن، بۆ وێنە:**

١-سەقامگیربوونی ئیسلام و دەسەڵات پەیداکردنی بەسەر زۆر شوێندا .وەك (بەتەنها رۆیشتنی کەسێ لە صنعاوە بۆ حضرموت) یان (لەنێوچوونی کیسرا) یان (ئازادکردنی قسطنطینیة) واتە ئەستەنبۆلی ئێستا.



٢-پەیدابوونی چەند دەججال و بانگەشەکەری پێغەمبەرایەتی: نزیکەی ٣٠ کەس کەهەموویان درۆزنن، ئەوانەی ڕوویانداوە وەك: (مسیلمة الکذاب، اسود العنسی، سجاح الیمانة، طلیحة الاسدی).

٣-ئاشوب وشەڕوشۆ، زانیاری کەم دەبێ، نەزانین زۆر دەبێ، داوێن پیسی زۆر دەبێ، شەڕابخۆری زۆر دەبێ، پیاو کەم دەبن ژن زۆر دەبن، تا ئەو ئاستەی ٥٠ ئافرەت تەنها یەك پیاو سەرپەرشتیان دەکات.

٤-خەڵکی پێخواس و ڕووت وشتر لەوەڕێن و مەڕ لەوەڕێن ببینی کە پیشبڕکێ لەبەرزکردنەوەی کۆشك وتەلار دەکەن.

٥-یارمەتی دانی ئەهلی کوفرو خۆشویستنی دنیاو پشت لەمردن و بوغزاندنی.

٦-پەیدابوونی پیاوانێك قامچی لەدەست بەچەشنی کلکی مانگا لەخەڵك دەدەن، ئافرەتێکی خۆداپۆشەری ڕووت، خەڵك لادەری ڕێ لێ ون بوو.

٧-پیاوی درۆزن بە راست دەزانرێ وبەپێچەوانەوە پیاوی راستگۆ بە درۆزن هەژماردەکرێ، ئەمیندار بەخیانەتکار، خیانەتکار بە ئەمین دەدرێتە قەڵەمێ.





**سێیەم: ئەو نیشانانەی کە هێشتا نەهاتوون:**

١-دووبـارە گەڕانـەوەی دوورگـەی عـەرەبی بـەڕووبارو بێـستان وباغات وپارە زۆر دەبێت تا ئەو ئەندازەی زەکاتی ماڵی خـۆی دەدات کەسی چنگ ناکەوێ لێی وەرگرێ.

٢-دڕندە قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات، سـەری قەمـچی و لاسـکی پێڵاوەکەی پیاو قسەی لەگەڵ نەکات، ڕانی خـۆی هـەواڵی پێنـەدات بەوەی کە دوای خۆی ماڵ وخێزانی چیان باسکردووە.

٣-وشك بوونی ڕووباری فوڕات ودەرکەوتنی خەزێنەیەکی زێر.

٤-جەنگ دەگەڵ جوولەکە بەرپادەکرێ و بـەرد بـانگی موسـڵمان دەکات کە ئـەوە جولەکەیـەو لـە پـشتمەوەیە خـۆی پـەناداوە، وەرن بیکوژن.

٥-هاتنی موحەممەدی مەهدی.

**چوارەم: ئەو نیشانانەی دوورن هێشتا نەهاتوون:**

١-هاتنی دەجال.

٢-هاتنەخوارەوەی حەزرەتی عیسا(علیه السلام).

٣-دەرچوونی یەئجووج ومەئجووج.

٤-پەیدابوونی دووکەڵ.

٥-٦-٧-ڕۆچوونی سێ شوێن لە ڕۆژهەڵات وڕۆژئاواو دورگەی عەرەب.



٨-هاتنە دەرەوەی زیندەوەری زەوی.

٩-هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە.

١٠-ئاگرێك کە خەڵك بەرەو شام ڕاپێچ دەکات.

## چیرۆکێك دەربارەی وانەی پێنجەم

ڕۆژێکیان ئاکام لە باوکی پرسی: باوکە گیان حیکمەت لە خەوتن چیە؟ بەڕاستی سەیرە..لەوەڵامدا پێی وت: خەوتن نیشانەیەکە پێمان ڕادەگەیەنێ کەهەموو مرۆڤێك کاتێ دەخەوێ ئاگای لەم دنیایە نامێنێ و کەچی زیندووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کەدەبێ باوەڕمان بەوە هەبێت ڕۆژێ دادێ هەر وەکو چۆن خوا لە نەبوونەوە دروستی کردووین، ئاوا جارێکی تر دەمانمرێنێ و دووبارە زیندوومان دەکاتەوە، چونکە ئەو شتانەی لەسەر زەوی دەیبینین هیچیان دادگەری تەواومان پیشان نادات، مەگەر دەبێ ڕۆژێك دابێ خوای گەورە دادگەری خۆیمان بۆدەرخات، ئەویش دوای مردن زیندوو بونەوەمانە.

* * *



## وانەی شەشەم

## باوەڕکردن بە قەزاو قەدەر

یەکێکە لەو پایە گرنگانەی کە پێویستە موسڵمانان لە دەروونەوە بروایان چەکەرەو گەشە بکات، بەوەی هەر خۆشی وناخۆشییەك کاروکردەو پێشهاتێك تاڵی وسوێرییەك دێتەبەردەمی ویست و ئیرادەی خوای لەسەرە.

**پرسیار: قەدەر یانی چی؟**

وەڵام: یانی ئەندازەگیری ونەخشەکێشان و بەرنامەدانانی خوا بۆ هەرچی هەبووەو هەیەو دەبێ، هەر لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد.

**پرسیار: قەزا یانی چی؟**

وەڵام: حوکم کردنی خوا بەجێ بەجێکردنی ئەو شتانە کە لەئەزەلەوە زانیاری وئیرادەی بێ سنوری پەیوەندییان پێوە بەستوون لە کات و شوێنی تایبەتیدا و بەشێوەو چۆنیەتی دیاریکراویان.

**پرسیار: دەتوانی بەکورتە باسێ ئەم بابەتە ڕۆشن بکەی؟**

وەڵام: بەڵێ، بۆ وێنە: هەر کتێبێك بەر لەوەی بنوسرێ و چاوی بەدونیای ڕوون هەڵێنێ، خاوەنەکەی - واتە دانەرەکەی- ئەندازەو چیەتی وچۆنیەتی لەخەیاڵ و بیرو هۆشی خۆیدا دەچەسپێنێ و

وێنەیەکی وەهمی بۆ دەکێشێ، دواتر دەست دەکات بەنووسینی وداڕشتنی و دێتە جیهانی واقیعەوە، هەڵبەتە بەبیرو خەیاڵ داهێنرانی کتێبەکە قەدەرە، نوسرانیشی قەزایە.

**پرسیار: ئەو کار و شتانەی مرۆڤ ئەنجامی دەدا خوا بەئاگایە لێیان؟**

وەڵام: بەڵێ، هیچ شتێ بێ ئاگاداری ئەو و ویستی ئەو ڕوونادات.

**پریسار: پایەی ئیمان بەقەزاوقەدەر چین؟**

وەڵام:

١-دانهاێنان بەزانیاری بێ سەرەتایی خوا، هەر لە ئەزەلەوە هەموو شتێکی زانیوە، بۆ وێنە: بڕواو چاکەی بڕواداران وبێ بڕوایی وخراپەی بێ بڕوایان وخراپەکاران.

٢-دانهێنان بەوەدا کە خوا هەموو شتێکی تۆمارکردوەو نووسیوە، بەر لەوەی دروستی بکا، بۆ وێنە: پێش هەموو دروستکراوەکانی(لوح المحفوظ)ی دروستکردوەو هەموو شتێکی تیانووسیوە، وەك لەفەرمودەدا هاتووە: خوا ئەندازەی دروستکراوەکانی نووسیوە پێش ئەوەی کە ئاسمانەکان وزەوی دروست بکات بە پەنجا هەزار ٥٠٠٠٠ساڵ.

٣-دانهێنان بەوەدا بەبێ ویست وخواستی خوا هیچ شتێ نەبووەو

هیچش نابێت.

٤-دانهێنان بەوەدا کە خوای پەروەردگار هەموو شتێکی دروست کردووە، جگە لەو بەدیهێنەری هیچ شتێك نیە، کەواتە هەر خوا خۆی بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

**پرسیار: بڕیاری خوایە کەسێ خراپەیەك دەکاو دواتر بڵێ هەر دەبوایە ئەو کارە روویدابوایە؟**

وەڵام: نەخێر، خوا بەئاگایە لەهەموو شتێ، بۆ وێنە: دزی کردن گوناهێکی گەورەیە، بابای دزیکەر پاساو بێنێتەوە بەوەی هەر دەبوایە ئەو کارەبکەم خوا ئاوا ویستی لەسەر بووە، ئەمە هەڵەیە، چۆن؟ با نموونەیەك بێنینەوە بۆ زێتر ڕوون بوونەوە: جارێکیان دزێکیان گرت وهێنایان بۆ لای خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوری خەتتاب(خوای لێی رازیبێ) خەلیفە فەرمووی: بۆچی دزی دەکەی؟ وتی: بڕیاری خوایە، هەر دەبێ دزی بکەم، ئینجا خەلیفە فەرمووی: ٣٠سی جەڵدەی لێبدەن ودەستیشی ببڕن، وتیان: تەنها دەست بڕینەکە بەس نییە؟ واتە سی جەڵدەکە زیادە، فەرمووی: دەست بڕینەکە لە جیاتی دزیەکەیەتی، بەڵام سی جەڵدەکە لەجیاتی ئەو درۆیەی بەدەم خواوە دەیکات کە دەڵێ: بڕیاری خوایە هەر دەبێ دزی بکەم، کەواتە ئەو کەسانەی کاروکردەوەی دزێو و ناشیرین دەکەن، دەڵێن چارەنووس





وابووە دەبوایە هەر ڕوویدات.

**پرسیار: خێرو خۆشی وچاکەوخراپە توشی مرۆڤدەبێ بۆچی؟**

وەڵام: هەموو بڕیارەکانی خوا "چ چاکە چ خراپە" هەمووی بۆ ئەوەیە تا مرۆڤی پێ تاقیبکرێتەوە.

**پرسیار: هەندێ شت هەیە مرۆڤ بەخراپ تێدەگا، سەرنجام بەچاکە بەسەری دەشکێتەوە ئەمە یانی چی؟**

وەڵام: لە هەقیقەتدا بڕیارو فەرمانەکانی خوا هەمووی خێرو چاکەن بۆ مرۆڤ، گەرچی بە ڕواڵەت وانەبێت، بۆ زێتر ڕوونبوونەوەی ئەم باسە وێنەیەك دەهێنینەوە:

سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: جارێ لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکردو پێی دەوت: ڕۆڵەکەم هەرچی هاتە ڕێگەت تاقیکردنەوەیە، گەرچی تۆ خراپەیەك دێتەپێشت بە خیانەت وخراپی هەژماردەکەی، بێ ئاگا لەوەی بە چاکە بەسەرتا دەشکێتەوە، کوڕەکەی وتی: ناتوانم وابم تا خۆم هەڵی نەسەنگێنم، لوقمان وتی: خوا پێغەمبەرێکی ناردووە بابڕۆین بۆ لای تا بۆمان ڕوون بکاتەوە، هەر دووکیان بەڕێکەوتن و سواری گوێدرێژێك بوون وە توێشوویان هەڵگرت، چەند شەو و ڕۆژێك ڕۆیشتن وماندوو بوون، چوونە ئەشکەوتێك حەسانەوە، دیسانەوە ڕێگەیان دایەبەر، گەرما زۆری بۆ هێنان و ئاو وتێشوویان پێنەماو گوێدرێژەکانیشیان لە پێکەوتن، ناچار دابەزین وبەپێ

ڕێگەیان گرتە بەر، لەم کاتەدا لوقمان دوکەڵ و ڕەشاییەکی لە دوورەوە بەرچاو کەوت، لە دڵی خۆیدا فەرمووی: ڕەشاییەکە دارو درەختە، دووکەڵەکەیش ئاوەدانی و مەڕو ماڵاتە، ڕۆیشتن کت وپڕ ئێسقانێك چوو بە قاچی کوڕەکەیداو لەسەر پێیەوە دەرهات و بێ هۆش کەوت! لوقمان کە تەماشای کرد پەلاماری برد بۆ کوڕەکەو بەددان ئێسقانەکەی دەرهێناو بۆی بەست وتا ئەندازەیەك بۆی بێتاقەت بوو، وە چەند فرمێسکێك لە چاوی کەوتنە خوارە، کەوتنە سەر گۆنای کوڕەکە، هاتەوە بەرخۆی و ڕووی کردە باوکی وتی: بابە تۆ دەڵێی ئەمە باشترە بۆت کەچی خۆیشت دەگریت..! ئاخر پێم ناڵێیت ئەم ڕووداوە باشیەکەی کامەیە؟! پێم ئاوای بەسەرداهات و ئاو وخۆراکیشمان پێنەماوە؟ لوقمان وتی: ڕۆڵە وادەزانم ئەوەی لێت لاداوە بەهۆی ئەم ڕوداوەوە زۆر زۆر گەورەترە لەم کارەساتە، لەو وتووێژەدا بوون لوقمان تەماشای بەردەمی کرد نەدووکەڵ دیاربوو، نە تارمایی، کەوتە گومانەوە بڵێی هیچم بەرچاو نەکەوتبێت، نەخێر بێگومان دووکەڵ و ڕەشاییم بەر چاو کەوت، بەڵام وا دەردەکەوێ خوای بەدەسەڵات کارێکی کردووە، لەم وتووێژەدا بوون کتوپڕ ئەسپ سوارێك پەیدابوو، لەهەوا تیژتربوو، ئینجا لە لوقمانی خووڕی بەسەریا وتی: تۆ لوقمانی وتی بەڵێ، وتی: ئەوە ئەو کوڕە تێنەگەیشتوەت چی وت؟ لوقمان وتی: تۆ کێیت دەنگت هەیەو





ڕەنگت نیـە؟ وتـی: مـن جـبریلم، مەگـەر پێغەمبـەرێکی مورسـەل ببینێت بۆیە نامبینیت، ئاگات لێ بوو کوڕەکەت چی وت؟ وادەزانـێ هەرچی ئەو حیکەمەتەکەی نەزانێ ئیتر لە خۆیـەوە پەیـدا بـووە بـێ هودە، باوا نەزانێ، خوای گەورە فەرمانی پێکردم بە نغرۆ کردنی ئـەم شارە کە ئێوە بۆی دەڕۆیـشتن، ئینجـا منـیش داوام کـرد لـە خـوای پەروەردگار کە ئەندازەیـەك ئێـوە ڕاگـیر بکـات تـا مـن هەڵدەسـتم بەکارەکەی خۆم، نەوەکو ئێوەش لەگەڵ ئەوانا تیابچن، ئـەوەبوو خـوا بەم شێوەیە دوایخستن، ئەگەر دوانەکەوتنایە ئێوەش تیادەچوون، ئینجا جوبریل دەستی هێنا بەقاچی کوڕەکەیدا خـوا شـیفای بـۆ نـارد، ئـاو وخۆراکەکەشیان وەك خۆی لێهاتەوە دوای ئەوە بـەهێزی هـەموویانی هەڵگرت ودەست بەجێ گەیاندنیانەوە جێی خۆی.

## چیرۆکێك دەربارەی وانەی شەشەم

ڕۆژێکیان مەڕووە لە دایکی پرسی: دایە گیان هەموو ئەو شـتانەی تووشمان دێت، هەمووی قەزاو قەدەرە؟ لە وەڵامدا دایکـی وتـی: بـەڵێ، قەزا و قەدەر یەکێکە لەپایەکانی ئیمان، دەبێ باوەڕمان بـەوە هـەبێت هەر شتێ خوا لە چارەیدا نوسی بێ، ئەو شتەمان دێتە ڕێ، بۆ نمونـە: مردن ئایا کەس هەیە بتوانێ و بڵێ من نامرم؟ بۆیە هـیچ شـتێ بـێ ئاگاداری ئـەو و ویـستی ئـەو ڕوونـادات، تەنانـەت هـەڵوەرینی ئـەو گەڵایەی لە لق وپۆپی دار هەڵدەوەرێ.



## وانەی حەوتەم

## ئایینی ئیسلام

ئیسلام: دینی خوای پەروەردگارە، کە بریتیە لە قورئانی پیرۆزو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، جگە لە دینی ئیسلام هیچ دین وبەرنامەیەکی دیکە جێگای پشت پێبەستن و کارپێکەرنیە، لەلای خواش تەنها ئیسلام قەبوولەو وەردەگیرێ ودینی راست وهەق وپەسندکراوە، بۆیە پێویستە مرۆڤ تەنها شوێن دینی خوا بکەوێ کەئیسلامە، خوا دەفەرموێ: ﴿بەڕاستی بەرنامەو دین لەلای خوا تەنها ئیسلامە﴾.

**پرسیار: ئیسلام یانی چییە؟**

وەڵام: واتە: گەردن کەچی وملکەچی بۆ خوای پەروەردگار.

**پرسیار: ئیسلام چیە؟**

وەڵام: ناوی بەرنامەو دینی ڕاست و پەسندی خوایە.



**وانەی هەشتەم**

## بەندایەتی و خوا پەرستی

بریتییە لە گوێڕایەڵی وگەردن کەچی بۆ خوای پەروەردگار، عیبادەت وخواپەرستیت بەپاکی و بەدڵسۆزی تەنها بۆ خوابێت، وە پابەند بوون بەو فەرمانانەی کە خوای پەروەردگار کردوونی چ لە قورئانی پیرۆز یان لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر، پێناسەیەکی تری بەندایەتی بریتیە لە: هەر شتێك کە خوای پەروەردگار خۆشی بوێ ولێی رازیبێ، جا چ وتە و گوفتاربێت، چ لەهەڵسوکەوت وکردەوەکان، بە ڕوون وئاشکرابێ یان لەپەنهان ونهێنیبێت.

مرۆڤ بەهۆی کردەوەکانی بەندایەتی خۆی دووپاتدەکاتەوە بەوەی بڕوابێنێ بە پایەکانی ئیمان وئیسلام، تا ئەو ئاستەی دەبێتە خۆشەویستی خوا، وە بەتەواوەتی گەردنکەچ بێت، ئەو کاتە بەندایەتی دێتەدی.

**پرسیار: بەندە کێیە؟**

وەڵام: بەندە ئەو کەسەیە ملکەچ بێت بۆ خوای پەروەردگار، خوای خۆشبوێت و پیادەی شەرعی خوابکاو رێ و شوێنی





پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) بگرێتەبەر.

**پرسیار: بەندایەتی چییە؟**

وەڵام: کاتێ بەندە ملکەچ دەبێ بۆخوا، لە دەم و ساتی ملکەچ و پابەندبوونی بەشەریعەتی خواوە، دەبێ ئەو بەجێهێنانەی کە خوا فەرمانی پێکردوە لە قسە و گوتار و کرداری ڕەنگبداتەوەو بەرجەستەبێ.

**پرسیار: ئەم بەندایەتیە بەچی دێتەدی؟**

وەڵام: بەر لەهەموو شتێ دەبێ بڕوای تەواوی بەسەرجەمی بڕگەو لق وپۆی پایەکانی ئیمان وئیسلام هەبێ، گەر تەنها بڕوای بەیەکێ لەمانە نەبێ بەندایەتیەکەی ناتەواوە، وە بەدڵسۆزی وخوامەبەستبوون ئەو کاروکردەوانە بەجێبهێنێ، وە دەبێ لەسەر شەریعەت وبەرنامەی ئایینی ئیسلام بێ.

* * *



## وانەی نۆیەم

### دین " ئایین"

بۆ ئاشنابوون و زێتر بەرچاو ڕوونی لە واتا و چەمکی دین دەبێ چاوێك لە قورئانی قسەلەجێ بڕوانین، دەبینین بە چوار واتایان هاتووە:

یەکەم: بە واتای سزاو پاداشت دێ.

دووەم: بەواتای گەردن کەچی دێ.

سێهەم: بەواتای بەرنامەی ژیان دێ.

چوارەم: بەواتای ئیسلام دێ.

**پرسیار: جگە لەدینی ئیسلام دینی تر هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ، وەك دینی یەهوودیەت - جولەکە- یان دینی نەصرانیەت - مەسیحی- .

**پرسیار: دینی هەق کامەیە؟**

وەڵام: دینی هەق وپەسندکراو لای خوا ئیسلامە.

**پرسیار: ئەی دینەکانی تر چین؟**

وەڵام: مەبەست لە یەهودی ونەصرانی، ئەمانە لە ئەسڵدا هەق و

ڕاستن لەلایەن خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسەر بێ) نێردراون، بەڵام دواتر دەستکاری وگۆڕانیان بەسەردا هاتووە لەلایەن مرۆڤەوە، بۆیە دینی ئیسلام ڕاست کەرەوەیانە، وەئەمانەش قەبووڵ و وەرناگیرێ لەلایەن خواوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿هەر کەسێ جگە لە ئیسلام دینێکی تر بخوازێ و شوێنی بکەوێت لێی قەبووڵ ناکرێ﴾.

❊ ❊ ❊



## وانەی دەیەم

# پایەکانی ئیسلام

١-شایەتمان.

٢-نوێژ بەرپاکردن.

٣-زەکات دان.

٤- ڕۆژووی مانگی رەمەزان.

٥-حەج کردنی ماڵی خوا.

**یەکەم: شایەتمان**

شایەتمان ئەوەیە شایەتی بدەی بەوەی کە جگە لەخوا هیچ پەرستراوێ نیە، وە شایەتی بدەی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان، بەوەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) نێردراو و ڕەوانەکراوی خوایە.

**پرسیار: چۆن شایەتمان بهێنین؟**

وەڵام: دەڵێی: اشهد أن لا اله الا الله، و اشهد أن محمدا رسول الله.

**پرسیار: شایتمان یانی چی؟**

وەڵام: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەراست نیە، جگە لە خوا (الله)...وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرو رەوانەکراوی خوایە.

**پرسیار: تەنها بەزمان ئەم ڕستەیە بڵێین؟**

وەڵام: نەخێر، دەبێ بەدڵ و بەقسە و بەکردارەکان بیسەلمێنین.



## وانەی پانزەم

# نوێژ بەرپاکردن

خوای پەروەردگار مرۆڤ و پەری بۆ ئەوە دروست کردوون تا بیپەرستن و فەرمانبەرداربن، جا بەم هۆیەوە خواپەرستی وبەندایەتی کردنی مرۆڤ لەپێناو وەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوایە کە ئەنجامی دەدات ، لەم روانگەوە پێغەمبەرانیش(سەلامی خوایان لەسەربێ) هەر بۆ ئەو مەبەستە نێردراون تا مرۆڤ لە نەزانی و تاریکی دەربێنن و ڕووەو خواناسی و بەندایەتیان ببەن، بەپێی ئەو یاساو بەرنامەیەی خوای پەروەردگار بۆ مەردومی داناوە ، یەکێك لەو خواپەرستیانەی مرۆڤی موسڵمان جێبەجێی دەکات نوێژە.

هەڵبەتە نوێژ کۆڵەکەی دینەو تاکە خواپەرستییە کەلە ئاسمانێ دا "الاسراء والمعراج" لەسەر موسڵمانان فەرزکرا، وچاکترینی کردەوە و مەزنترین وبەرزترینی بەندایەتی وگەردنکەچیە، نوێژ گفتوگۆو قسەکردنە لەگەڵ خوا..نوێژ پەیمان بەستنە لەگەڵ خوا.. نوێژ ڕەزامەندی خوایە..نوێژ کلیلی بەهەشتە..نوێژ جەنگانە لەگەڵ شەیتان..نوێژ قەڵغانی باوەڕدارە..نوێژ ڕەوێنەوەی خەم و دڵتەنگییە، ئارامگرییە..نوێژ ڕێگەی بەختەوەرییە..نوێژ هێز و توانایی ڕۆحە،

فێنکی دەروونە.. نوێژ مەشقە، وەرزشە..نوێژ پاك وخاوێنییە، نوێژ چاکەکاری ،دەستپاکی ،داوێن پاکی، دەمپاکی، لێبوردەیی ، رووخۆشی لەدواوەیە.. بەڵام چ نوێژێ؟! نوێژێك کەخوای پەروەردگار داوای دەکا، وە یەکەم شتە لە رۆژی دوایی بەندەکان لەسەری لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێ نوێژە ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) واتە : {یەکەم شتێك کە بەندەی لەسەر موحاسەبەدەکرێت لە رۆژی دوایی نوێژە، جا ئەگەر نوێژەکەی چاك بوو، ئەوە هەموو کردەوەکانی تریشی چاك دەبێت، وە ئەگەر خراپ بوو هەموو کردەوەکانی دی خراپ دەبێ} الطبراني ریوایەتی کردوە.

بۆیە دەبێ نوێژەکانمان بەجوانی ورێك وپێکی وخشوعی وملکەچی وخوامەبەست بوون وبێ رووپامایی ئەنجام بدەین وکەمتەرخەم نەبین ، تا بەر هەرەشەی خوا نەکەوین هەروەکو دەفەرموێ: واتە: {وای بۆ نوێژ کەران ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان ئەوانەی کە رِوپامایی دەکەن}، پێویستە ئێمەش نوێژەکانمان بە شێوەیەکی جوان ورێك وپێك ئەنجام بدەین و بەرپا بکەین.

**پرسیار: پێویستە بەر لەنوێژکردن چی بکەین؟**

وەڵام: زۆر هەنگاو هەیە بیگرینە بەر، بۆ وێنە: خۆپاککردنەوە لە لەش پیسی ودەست نوێژو کاتی بانگ و...هتد.

**پرسیار: چۆن دەست نوێژ دەگرین؟**

وەڵام: بەپێی ئەم شێوازی خوارەوە:

١-نیەتهێنان بەدڵ.

٢-شۆردنی دەم وچاو.

٣-شۆردنی هەر دوو دەستان لەگەڵ ئانیشکەکانی.

٤-مەسحکردنی بەشێکی سەر، دەست هێنان بەتەڕی بەسەر سەردا.

٥-شۆردنی هەر دوو پێیەکان لەگەڵ گۆزینگەکانی، قولەپێ.

٦-بەجێهێنانی ئەم خاڵانە بەریز لەدوای یەك بەبێ پاش وپێش خستن.

**تێبینی:** مامۆستای بەرێز دەتوانی سوننەتەکانی دەستنوێژ بۆ رۆڵەکەت باس بکەین، چونکە ئێمە بەپێی ئایەتی قورئان باسمانکردوە.

**پرسیار: چۆن بانگ دەدرێ؟**

وەڵام: بەم شێوەیە:

الله اکبر الله اکبر

الله اکبر الله اکبر

اشهد ان لااله الا الله





اشهد ان لااله الا الله

اشهد ان محمدا رسول الله

اشهد ان محمدا رسول الله

حي على الصلاة

حي على الصلاة

حي على الفلاح

حي على الفلاح

الله اكبر     الله اكبر

لااله الا الله

**پرسیار: ئایا هیچ گۆڕانکاری بەسەر دێت؟**

وەڵام: نەخێر، تەنها لە نوێـژی بـەیانی لـەدوای **حـي علـى الفـلاح** سوننەتە دوو جار بوترێ: " **الصلاة خير من النـوم**" واتـە: نوێـژ لـە خەوتن باشترە.

**پرسیار:لە شەو و رۆژێکدا چەند جار بانگ دەدرێ؟**

وەڵام: لە شەو و رۆژێکدا (٥) پێنج جار بانگ دەدرێ.

**پرسیار: چۆن وەڵامی بانگ دەدەیتەوە؟**

وەڵام: هەر کاتێ گوێت لـە بـانگ بـوو یـا ئیقامـەت، سـوننەتە ئێمەش وەکو بانگوێژ، وشەکان بڵێینەوە، تـەنها لـەکاتی گەیـشتنە"

حي على الصلاة ، حي على الفلاح" دەڵـێین: " لاحـول ولا قـوة إلا بالله" .

**پرسیار: کاتێ بانگ تەواو بوو چی بکەین؟**

وەڵام: سوننەتە بڵـێین: ﴿أللـهُمَّ ربَّ هـذهِ الـدَّعوةِ التامـةِ والـصلاةِ القائمةِ ات محمداً الوسـيلة والفـضيلَةَ وابْعَثـهُ مقامـاً محمـوداً الـذى وعدْتَهُ﴾ئیمامی البخاری ریوایەتی کردووە.

**پرسیار: لە شەو و رۆژێکدا ژمارەی نوێـژە فـەرزەکان چـەندن وکامانەن؟**

وەڵام: لە شەو ورۆژێکدا (٥) پێنج نوێژ لەسـەرمان فـەرز کـراوە، کەبریتین لەمانە:

١-نوێژی بەیانی = ٢ = رکعاتە.

٢-نوێژی نیوەڕۆ = ٤ = رکعاتە.

٣- نوێژی عەسر = ٤ = رکعاتە.

٤- نوێژی شێوان "مەغریب" = ٣ = رکعاتە.

٥-نوێژی خەوتنان"عشاء" = ٤ =رکعاتە.

**پرسیار: مەرجەکانی دروستی نوێژ چین؟**

وەڵام: چەند مەرجێکە وەك:

١-هاتنی کاتی بانگ.



٢-پاکی لە لەش پیسی وبێ دەست نوێژی، واتە: بێ مەرجەکانی دەست نوێژ، نوێژ دروست نیە.

٣-پاك وخاوێنی لاش‌و جل وبەرگ وجێگا و شوێنی نوێژکردن.

٤-خۆداپۆشین، بۆ پیاوان لەسەرووی ناوك تا خوار ئەژنۆ، بۆ ئافرەتان هەموو لاشەیان جگە لە رووخسار و لەپەدەستانی.

٥- ڕووکردنە رووگە" قیبلە" .

**پرسیار: چۆن قامەت دەکرێت لە دەمی هەستان بۆ نوێژبەرپاکردن؟**

وەلاّم: قامەت لەو کاتە دەکرێ کە کاتی نوێژ هاتبێ، ئا بەم شێوەی خوارەوە:

الله اکبر    الله اکبر

اشهد ان لااله الا الله

اشهد ان محمدا رسول الله

حي علی الصلاة

حي علی الفلاح

قد قامت الصلاة

قد قامت الصلاة

الله اکبر    الله اکبر

لااله الا الله



**پرسیار: چۆن نوێژ دەکەیت؟**

وەڵام: بەم  شێوازەی لای خوارەوە:

**١-  نیەت - نیاز —**

بەر لەهەموو شتێ هەر کارو کردەوەیەکی خواپەرستی ئەنجامی دەدەیت نیازو نیەتی دڵە، وە بێ نیەت ودڵسۆزی بۆ خوا دانامەزرێ و، وەرناگیرێ: پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێ:﴿إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى﴾ رواه البخاري ومسلم/ واتە:{کاروکردەوەی ئادەمیزاد بەنیازو خواستی ناو دڵی نەبێ دانامەزرێ هەموو کەسێك هەر پاداش وسزای نیازو خواستی ناو دڵی خۆی پێ دەگا }.

لە دەستپێکدا نیەت دێنی بەوەی بیزانی ئەو نوێژەی بەرپای دەکەی فەرزە یان سوننەتە .. بەکۆمەڵە یا بەتەنهایت..چ نوێژێکەو چەند ڕکاتە، دەبێ لەدڵی خۆتدا بەزمانی دڵ بیڵێیت.

**٢- وتنی - الله اکبر-  ی نوێژ دابەستن**

دوای نیەت هێنان تەکبیرەی ئیحرام — الله اکبر- وتنە.

**٣-  وەستان وچۆنیەتی دەست بەرزکردنەوە**

*وەستان بەپێوە لەنوێژە فەرزەکان.





* کەسێ نەشێ ونەتوانێ بەپێوە ئەنجامی بدات، دەتوانێ بەدانیشتنەوە نوێژ بەرپابکات.

* وێك نەهێنانەوەو جیاکردنەوەو دوور خستەوەی پێیەکانت لەیەکتر، وەك سوننەتە بەقەد بستێ لێك دووربن.

*بەرزکردنەوەی دەستەکانت لە پێشی یا لە دوای یا ئەوەتە لەگەڵ وتنی" الله اكبر " هەردووك دەستەکانت بەرزبکەوە.

*لە کاتی دەست بەرزکردنەوە با پەنجەکانت نە زۆر پێکەوە نووساوبن، وە نە بەو ئەندازە کراوەو بلاوین، بەلکو لەبارێکی ئاسایی ین.

* بەرزکردنەوەی دەستەکانت تا ئاست و رادەی شانەکانت یان تا نزیك ئاستی نەرمەی گوێکانت.

* هەر یەکێ لەمانە ئەنجام بدەیت سوننەتەو درووستە.

## ٤- چۆنیەتی و دانانی دەستی راست بەسەر دەستی چەپە

زانیت بەرزکردنەوەی هەردووك دەستانت تا چ ئاستێکن، ئەوسا دوای هێنانە خوارەوەی، دانان وخستنەسەر یەکتری دەستی راست بەسەر دەستی چەپە.

*دەستی راستت لەسەر پشتی دەستی چەپت دانێ.

*دەستی راستت لەسەر جومگەو بازنەی دەستی چەپ دانێ.



*دەستی راست دانان لەسەر مەچەك و باسك ودەستی چەپت.

* هەر یەكێكیان ئەنجامدەیت سوننەتەو دروستە.

**٥- شوێنی دانانی دەستەكان**

دانان وچۆنیەتیەكەمان زانی ئێستا شوێنی جێگیر بوونەكە دەخەینەڕوو، گەرچی ناتوانین بەوردی شوێنێكی دیاركراو دەستنیشان بكەین، بەڵكو دەشێ ودەگونجێ هەر دوو دەست لەسەر سینگ دانان، یان نزمترو خوارەوەتری سینگ واتە نێوانی نێوك وسینگ، بەڵام خوارەوەی نێوك وسەرەوەی سینگ دەق وبەڵگەیەكی ئەوتۆی لە بارەوەنییە.

**٦- سەیركردنی شوێنی كوڕنووش و وەستان بە- الخشوع- یەوە**

سەیركردن وچاوبڕینە زەوی، ئەوشوێنەی كە سوژدەی لەسەر دەبەی ونێوچاوانتی دەخەیەسەر، حەڕامە سەر بەرزكردنەوە وچاو بگێڕی بەئاسمانێ دا ، یان لاربوونەوەو بەولاو بەولاداهاتن و ڕوو وەرگێران، وە دەست نەگرتن بەكەلە!

*بە گەردنكەچی ودڵسۆزی وخشوعی بوەستە بەرامبەر پەروەردگار.

**٧- زیكرو دوعاكانی دەستپێكردنی نوێژ**

دوای رێك وپێك وەستان و ملكەچی وچاوبڕینە شوێنی كوڕنووش





ئەمێستا چەند دووعاو پاڕانەوەیەك بخوێنە:

*﴿ اللهُم باعِد بَيني وبَيـنَ خَطَايـايَ كَمَا بَاعَدتَ بَيـنَ المَشرِقِ وَالمَغْرِبِ، اللهُمَّ نَقِّني مِن خَطَايَايَ كَمَا يَنقِـي الثَّوابُ الأبيَضُ مِـنَ الـدَّنَسِ، اللَّهُـمَّ اغسِل خَطَايَـايَ بِالمَـاء والـثَّلجِ وَالبَـرَدِ﴾البخـاری ومسلم.

واتــە: {خوایــە گیــان نێــوان مــن وتاوانــەکانم ئەوەنــدەی نێــوان ڕۆژهەڵات ورۆژئاوا دووربخــەرەوە، خوایــە گیــان لــە تاوانــەکانم پــاکم بکەرەوە وەك چۆن جل وبەرگی سپی لەچڵك وپیسی پــاك ئەکرێتــەوە، خوایە گیان بە ئاوو بەفرو تەرزە تاوانەکانم بم شۆرە}.

*﴿وَجَّهتُ وَجْهِيَ لِلَّذى فَطَـرَ الـسَّماواتِ وَالأرضَ حَنفـاً وَمَـا أنـا مِنَ الْمُشرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾رواه مسلم.

واتــە: {ڕووی خــۆمم کــردە بەدیهێنــەری ئاسمانــەکان وزەوی، ڕاســتەڕێم گرتــووە وموســڵمانم، وە مــن لــە هاوبــەش دانــەران نــیم، بەڕاســتی نوێــژو پەرســتنم وژیــان ومــردنم بــۆ خــوای پــەروەردگاری جیهانەکانە، هیچ هاوبەشی نـین، وەهــەر هــەر بــەوەش فــەرمانم پــێ کراوە، وە من لە موسڵمانانم}.

*﴿سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَـارَكَ اسُـمكَ، وَتَعَـالَى جَـدُّكَ، وَلاَ

إِلَه غَيُركَ﴾رواه ابو داود والحاكم.

واتە: {خوایە تۆ پاك وبێ گەردی سوپاس وستایش شایستەی تۆیە، ناوت پیرۆزەو خاوەنی بەرزی وشکۆی، جگە لەتۆ هیچ پەرستراو نینە}.

*جگە لەمانە زۆری ترهەن،گەر بۆی بڕوانی و ویستی لەبەرکردنت بێ.

*وا چاکە هەر جارەی یەکێ لەم نزاودوعایانە وەخوێنێ.

## ٨- پەنا بەخواگرتن- استعاذة-کردن

یەکێ لەو دوعایانەی کەئاماژەمان پێ دا، خوێندت، پەنابەخوا بگرە - استعاذة- بکە:

١- ﴿أعوذ بالله من الشيطان الرجيم﴾ رواه إبن المنذر.

واتە: {پەنا بەخوا دەگرم لە شەیتانی نەفرینکراو}.

٢- ﴿أعوذ بالله السمع العليم من الشيطان الرجيم﴾ رواه ابو داود والترمذي.

واتە: {پەنا بەخوای بیسەرو زانا دەگرم لە شەیتانی نەفرینکراو}.

* سەرپشکی لە وتنی یەکێ لەم شێوانە، ئەمیش لە ڕکاتی یەکەمی نوێژ بەر لەخوێندنی فاتیحە.





* سوننەتە بەدەنگی نزم بخوێنرێ، لەنوێژە ئاشکراکان.

**٩- خوێندنی سورەتی فاتیحە**

بــەڵێ: دوای - استعاذة- کــردن ســـورەتی فاتیحـــە بخوێنـــە، بەشێوەیەك جوێ کردنەوە وهەڵوەستە کـردن لـە نێـوانی ئایەتەکانـدا هەبێ، ئاوا:

بسم الله الرحمن الرحیم- بوەســتەو هەڵوەســتەیەکی کـورت بکـەو دواتر بڵـێ: ﴿ الْحَمْدُ للَّـهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ﴾ بەهـەمان شـێوەی یەکـەم بوەستەو هەڵوەسـتەیەکی کـورت بکـەو بڵـێ: ﴿الـرَّحْمنِ الـرَّحِيمِ ﴾ دیسان بەشێوەی پێشوو بوەسـتەو هەڵوەسـتەبکەو بڵـێ:﴿ مَلِـكِ يَـوْمِ الدِّينِ..﴾ بەم شێوەو چەشنە تا دوماهی بەسورەتەکە دێ.

**١٠- وتنی ئامیین - امین-**

دوای تەواوکردنی سـورەتی فاتیحـەو ڕسـتەی: ﴿غَـيرِ المَغـضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ﴾ بڵێ: امین.

دوای وتنی ئامین گەر نوێژەکە بەکۆمەڵ و ئاشکرابوو واتە نوێژی" بەیانی ومەغریب وعیشا" بوو دەبێ ئیمام هەڵوەستەیەك بکـا دواتـر دوای خوێندنی فاتیحەو هەڵوەستەکردنەکە قورئان بخوێنێ.

**١١- قورئان خوێندنی دوای سورەتی فاتیحە**

سوننەتە لە دوای خوێندنی فاتیحە هەندێ قورئـان بخـوێنرێ، جـا



سورەتێ یا سێ ئایەت یا زێتر لەوە، جا درێژ یا کورت بەپێی ئەو هەلومەرجەی رەخساوە بەتایبەت لە نوێژە سوننەتەکان بۆ وێنە شەونوێژ، لێرە باس لەوە ناکەین چ سورەتێ یا ئەندازەی چەند ئایەت بخوێنی تەنها باس لە نوێژە فەرزەکان دەکەین کەپێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دوای سورەتی فاتیحە قورئانی تیاخوێندووە.

*نوێژی بەیانی: لەهەر دوو رکاتەکاندا لەدوای فاتیحە قورئانی تیاخوێندووە، لەرکاتی یەکەم زێتری خوێندووە لە رکاتی دووەم، جاری واش هەبوو تەنها سورەتێکی لە دوو رکاتان خوێندووە.

*نوێژی نیوەرۆ: لە رکاتی یەکەم ودووەم، دوو سورەت یان ئەندازەی چەند ئایەتێکی خوێندووە، وە هەندێ جار لە رکاتی سێیەم وچوارەم تییایدا خوێندویەتی.

*نوێژی عەسر: لە رکاتی یەکەم ودووەم قورئانی تیا خوێندووە، لە دوو رکاتی کۆتایی تەنها سورەتی فاتیحەی دەخوێند.

*نوێژی مەغریب: تەنها لە رکاتی یەکەم ودووەم قورئانی تیا خوێندووە.

*نوێژی عیشا: ئەمیش بەچەشنی نوێژی شێوان - مەغریب- تەنها لە رکاتی یەکەم ودووەم قورئانی تیا خوێندووە.

## ١٢- کڕنووش بردن - ڕکووع-

له پاش خوێندنی ئەو بڕە قورئانەی لە دوای فاتیحە خوێندت بە پەلەپروزێ مەچۆرە ڕکووع بەڵکە هەڵوەستەیەك بکە:

*دەستەکانت بەرزبکەوەو بڵێ: الله اکبر.

*دانانی ناولەپی دەستان لەسەر ئەژنۆو چۆکەکان.

*پەنجە لێك جوێ کردنەوەو ئانیشك لە لاتەنیشت دوورخستنەوە.

*پشتت ڕێك وراست ویەکسان بکە.

*سەر نزم نەکردن و بەرز نەکردنی لە ئاستی پشت،ڕێکی پشت بێ.

*درێژکردنەوەو ئارام گرتن لە رکووعدا.

* خوێندنی یەکێ لەم زیکرودوعایانە:

١- ﴿ سُبْحَانَ رَبِّي العَظِيم﴾ رواه ابو داود وابن ماجة.

واتە: {پەروەردگاری گەورەم بە پاك دەگرم}.

٢- ﴿سُبْحَانَ رَبِّي العَظِيم وَبِحَمدِهِ﴾ رواه احمد وابو داود والطبراني والبيهقي.

واتە: {پەروەردگاری گەورەم بەپاك دەگرم وسوپاس وستایشی دەکەم}.

*خوێندنی ئەوانە سێ جار یان زێتر.



* جگە لەمانە چەند زیکرێکی تر هەیە.

### ١٣- هەستانەوە لە ڕکووع

لە دەمی پشت راستکردنەوەو هەڵسانەوە ، بڵێ : ﴿سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ﴾البخاري ومسلم.

واتە: {خوای گەورە بیسەر بوو، بۆ ئەو کەسەی سوپاس وستایشی کرد}.

*سوننەتە دەستەکانت بەرزبکەیتەوە.

* کەتەواو پشتت راستکردەوەو لەباری چونەوە باریەکدی ئێسقانەکان وقەرار گرتنیان ، بڵێ: ﴿ربَّنَا ولَكَ الحَمد﴾ یان ﴿ربَّنَا لَكَ الحَمد﴾ رواه البخاري/ واتە: {ئەی پەروەردگارمان بۆ تۆیە سوپاس وستایش}.

*دەتوانی دوای وتنی ﴿سَمِعَ اللهُ لِمَن حَمِدَهُ﴾ ئەوە بڵێی: ﴿ربَّنَا لَكَ الحَمدُ حَمداً كَثِيرًا طَيِّباً مُبَارَكًا فِيهِ﴾رواه البخاري وأبو داود.

واتە: {پەروەردگارمان ستایش هەر بۆ تۆیە، ستایشێکی زۆرو پاك وپیرۆز}.

### ١٤- کڕنووش بردن –سوژدە-

پاش ئەوەی هەڵسایەوە لە رکووع دواتر بەدەم کرنووش بردنەوە

بڵێ: الله اكبر.

*دەستەكانت لەلایەكان وتەنیشتەكانت دووربكەوە.

*ئەژنۆت دانێ ودواتر لەپی دەستەكانت ڕابخە.

*پەنجەكانت بەیەكەو بلكێنەو ڕووەو قیبلە.

*بۆ پیاوان ڕانەخستنی دەستەكانت وبەلاشەتەوە نەینوسێنی.

*دانانی دەستەكانت، لەئاست هەردوو شانەكانت، یان لە ئاست گوێكانت.

* ئەو حەوت ئەندامە بەسەر زەوی جێگیربكە.

- نێو لەپی دەستەكانت..ئەژنۆكانت..پێیەكان، پەنجەكانی پێ..نێوچاوان ولووت.

* مانەوەو ئارامگرتن - إطمئنان-.

*خوێندنی سێ جار یان زێتری ئەم زیكرانە:

١- ﴿ سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلى ﴾ رواه أبو داود وابن ماجة والطبراني.

واتە: { پەروەردگاری هەرە بەرزم بەپاك وبێگەرد دەگرم}.

٢- ﴿سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلى وبحمده ﴾ رواه أبو داود وأحمد والطبراني والدار قطني.

واتە: { پەروەردگاری هەرە بەرزم بەپاك وبێگەرد دەگرم وسوپاس





وستایشی دەکەم }.

**١٥- هەستانەوە لە سووژدە**

دوای ئـەوەی بـەرێك وپێكـی وئـارامگری وبەوشـێوەی باسـكرا سوژدەت برد.

*بەدەم — الله اكبر- ەوە هەڵسەوە.

* پێی چەپت ڕاخـەو لەسـەری دانیـشە وپێـی ڕاستت لـە زەوی بچەقێنە ، یا لەسـەر هـەر دوو پاژنەوسـنگی پێیـەكان دانیـشە، یـا پەنجەكانی پێت بچەقێنە بەزەوی دا.

*هەمدیس ئارامبگرەو ئەم زیكرانە بخوێنە:

**١- ﴿رَبِّ اغفِر لِي رَبِّ اغفِر لِي﴾ رواه إبن ماجة بسند حسن.**

واتە :{پەروەردگارم لێم خۆشبە، پەروەردگارم لێم خۆشبە} .

**٢- ﴿(اللَّهُمَّ) يان (رَبِّ) اغفِـر لِـي وَارحَمنِـي وَاجْبُرنِـي وَارفعـني وَاهـدِنِي وَعَـافِنِي وَارزُقنِـي﴾ رواه أبـو داود والترمـذي وإبـن ماجـة وصححه و وافقه الذهبي .**

واتە :{(خوایە گیان) یا (پەروەردگارم) لێم خۆشبە وبەزەییت پێم دابێ وپشتم بگرەو بەرزمكـەوە ورێنمـوونیم بكـە وسـەلامەتم بكـەو رۆزیم بدە} .



**١٦- چوونەوە سوژدەی دووەم**

بـەدەم چـوونەوە کورنـووش بردنـی دووەم - الله اکـبر- بکـە، بەچەشنی سوژدەی یەکەم ئەم دوعاو زیکرانە بخوێنە بەبێ گۆڕانکـاری وجیاوازی.

**١٧- هەڵسانەوەو هەڵوەستەکردنی دانیشتن**

پاش سوژدەبردنی دووەم هەڵسەوە و هەڵوەستە بکـە وئینجـا بـە دەم راست بوونەوە وهەڵسانەوە بۆ ڕکاتی دووەم - الله اکبر- بکە.

**١٨- هەڵسانەوە بۆ ڕکاتی دووەم**

ئەو چەند خاڵەی باس کرا بەلق وپۆپـەکانی، ڕکـاتی یەکـەم بـوو، ئێستاش بەچەشنی ڕکاتی یەکەم، ڕکاتی دووەم بەرپابکەو وەجێبێنـە، تەنها چەند وردە شتێ دووبارە نابێتەوە:

*لە کاتی هەڵسانەوە سورەتی فاتیحە بخوێنە.

*نەخوێندنی زیکرو دوعای دەستپێکردنی نوێژ.

*خوێندنی قورئانی دوای فاتیحە، کەمترە لەم ڕکاتی دووەمەدا.

**١٩- تەحیاتی یەکەم وشێوەی دانیشتن**

*دانانی لەپی دەستەکانت لەسەر هەر دوو ڕان یـا ئـەژنۆ، راسـت لەسەر راست چەپ لەسەر چەپ.

* پێی چەپەت ڕابخەو لەسەری دانیشەو پێی ڕاستت بچەقێنە .

*پەنجەی دەستی ڕاستت بنوقێنەو ئاماژە بەپەنجەی شایەتوومان بکە.

*بە پەنجەکانی دەستی ڕاستت ژمارە پەنجاوسێ دروست بکەو پەنجەی شایەتمان ئاماژە ڕووەو قیبلە بکە.

*چاوبڕینە پەنجەی شایەتوومان.

*خوێندنی تەحیات:

١- ﴿ التَّحِيَّاتُ لله وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلامُ عَلَيكَ أيُّها النَّبيُّ ورَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَينَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، اشهَدُ أن لا إلَهَ إلا الله وَأشهَدُ أن مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ﴾ متفق عليه.

٢- ﴿ التَّحِيَّاتُ المُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لله، السَّلامُ عَلَيكَ أيُّها النَّبيُّ ورَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَينَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، اشهَدُ أن لا إلَهَ إلا الله وَأشهَدُ أن مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ﴾ رواه مسلم والنسائي والشافعي.

٣-﴿ التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ وَالصَّلَوَاتُ لله، السَّلامُ عَلَيكَ أيُّها النَّبيُّ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلامُ عَلَينَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، اشهَدُ أن لا إلَهَ إلا الله وَأشهَدُ أن مُحَمَّداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ﴾ رواه مسلم





وأبوعوانه.

*کاتێ گەیشتیە شەهادەت هێنان لـە سـات ودەمـی وتنـی (إلا الله) ئەو کاتە پەنجەی شایەتمان بەرزبکەوە.

*نەجوڵانی پەنجەی شایەتوومان.

*پاش شایەتمان سەڵاوات لێبدە، تەنها بـە وتنـی: ﴿ اللـهم صـل علی محمد﴾.

**٢٠- هەستانەوە بۆ ڕکاتی سێهەم دواتر چوارەم**

پشتی ئەوەی تەحیاتی یەکەمت خوێند بەدەم وتنـی - الله اکـبر- ەوە هەڵسەوە بۆ ڕکاتی سێ یەم وبەهەمان شێوە ڕکاتی چوارەمیش وا بەرپابکە.

**٢١- تەحیاتی کۆتایی**

جیا لە تەحیاتی یەکەم چەند خاڵ وبەجێهێنانێ هەیە:

*پێی چەپت لەلای ڕاستەوە تێپەڕێنە و پێـی ڕاسـتت بـچەقێنەو لەسەر سمتان دابنیشە.

*واجبێتی خوێندنی تەحیات.

* سەڵاوات دانە لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

* ئەمەو چەند جۆرێ لە سەڵاوات:

١- ﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ عَلَى آلِ

إبراهِيمَ إِنَكَ حَمِيدٌ مَجِيد ، أللهُمَّ وَبَارِكَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى الِ إبرَاهِيمَ إِنَكَ حَمِيدٌ مَجِيد﴾رواه البخاري ومسلم وأبو داود والنسائي وإبن ماجة.

٢- ﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِّى الأُمِي وَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ عَلَى الِ إبرَاهِيمَ ، وَبَارِكَ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِّى الأُمِي وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى الِ إبرَاهِيمَ فِي العَالمِين إِنَكَ حَمِيدٌ مَجِيد﴾ رواه مسلم وأبو داود وصححه الحاكم.

٣- ﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَ عَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ عَلَى الِ إبرَاهِيمَ، وَبَارِكَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى الِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى الِ إبرَاهِيمَ إِنَكَ حَمِيدٌ مَجِيد﴾رواه أحمد ومسلم والنسائي وصححه.

**٢٢- خوێندنی دوعای دوای تەحیات**

بەر لەوەی سەلام دەیتەوە چەند دووعاوپاڕانەوەیەك هەیە بیانخوێنە، ئەوسا سەلام بدەوە.

١- ﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِن عَذَابِ القَبرِ، وَمِن فِتنَةِ المَحيَا وَالمَمَاتِ وَمِن شَرِّ فِتنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ﴾ رواه مسلم.

واتە :{خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لەسزای دۆزەخ وسزای نێو گۆڕ، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لە فیتنەوبەڵای ژیان ومردن و فیتنەوبەڵای



شەڕی مەسیحی دەجال}.

٢ -﴿اللّهُمَّ إنِّی أعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ القَبرِ، وَأعُوذُ بِكَ مِن فِتنَةِ الدَّجَّالِ وَأعُوذُ بِكَ مِن فِتنَةِ المَحيَا وَالمَمَاتِ، اللّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن المَأثَمِ وَالمَغرَمِ﴾ متفق عليه.

واتە :{خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە سزای گۆڕ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە فیتنەی دەجال وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە فیتنەو بەڵای ژیان ومردن، خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە تاوان وقەرزداری}.

٣- ﴿ اللّهُمَّ إنِّي ظَلَمتُ نَفسِي ظُلمًا كَثِيرا، وَلايَغفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنتَ، فَاغفِر لِي مَغفِرَةً مِن عِندِكَ وَارحَمنِي إنَّكَ أنتَ الغَفُورُ الرَّحِيم﴾ رواه البخاري ومسلم.

واتە :{خوایە من ستەمم لە خۆم كردووە ستەمێكی زۆر، جگە لە تۆش كەس لەتاوان نابووریّ، خوایە لێم ببوورە بە لێبوردنێك لەلایەن خۆت و ڕەحمم پی بكە، هەر تۆی لێبوردەی بەبەزەیی}.

٤- ﴿اللّهُمَّ اغفِر لِي مَا قَدَّمتُ وَمَا أخَّرتُ، وَمَا أسرَرتُ وَمَا أعلَنتُ وَمَا أسرَفتُ وَمَا أنتَ أعلَمُ بِهِ مِنِّي، أنتَ المُقَدِّمُ وَأنتَ المُؤَخِّرُ، لا إلَهَ أنتَ﴾ رواه مسلم.

واتە :{خوایە لێم خۆشبە لەوەی پێشم خستووەو لەوەی دوام خستوە وە لەوەی پەنهانم كردووەو ئاشكرام كردوە، وە لەوەی بە



زیادەڕۆیی کردوومە، خودایە تۆ زاناو زانیاری، تۆی پێشخەرو تۆی دواخەر، جگە لە تۆ هیچ پەرستراو نین}.

٥- ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ الجَنَّةَ، وَ أَعُذُ بِكَ مِنَ النَّار﴾رواه احمد وأبو داود.

واتە :{خوایە من داوات لێ دەکەم بەهەشتم پێ ببەخشیت وپەنات پێ ئەگرم لە ئاگری دۆزەخ}.

* جگە لەمانە،گەلێ دوعای تر هەیە، دەتوانی بیانخوێنی.

## ٢٣- سەلام دانەوە

*سەلام دانەوە لەلای راست و، وتنی :﴿ السلام عليكم ورحمة الله﴾رواه الخمسة وصححه الترمذي.

*سەلام دانەوە بۆ لای چەپ و، وتنی :﴿ السلام عليكم ورحمة الله﴾رواه الخمسة وصححه الترمذي.

* پێغەمبەر هەندێ جار لە سەلامدانەوەی یەکەمدا (وبركاته) ی زیاد کردووە، :﴿ السلام عليكم ورحمة الله وبركاته﴾. رواه أبو داود وابن خزيمة.

*وە هەندێ جار، لەکاتی سەلامدانەوەدا.. بەلای راستدا دەیفەرموو:﴿ السلام عليكم ورحمة الله﴾. وە بەلای چەپیشدا



دەیفەرموو:﴿ السلام علیکم﴾ رواه النسائی وأحمد والسراج بسند صحیح.

پرسیار: نوێژی سڵاوی مزگەوت (تحیة المسجد) چییە؟

وەڵام: هەر کاتێ بابای موسڵمان چووە نێو مزگەوت بەر لەوەی دانیشێ سوننەتە ئەم نوێژە بەرپابکات، ئەم نوێژەش دوو رکاتە.

* * *

## وانەی دوازدەم

## زەکـــــات دان

زەکات یەکێکە لەپایەکانی ئیسلام، جێبەجێکردنی خواپەرستییە، دەبێ بەپاك ودڵسۆزی، تەنها لەبەر خاتری خوا و رەزامەندی خوابێ، زەکات پاکبونەوەیە لەڕووی ماددی و رۆحییەوە بەو واتایەی هەم سامانەکە پاك دەبێتەوە، هەم لەڕووی مەعنەوی و رۆحی پاکدەبیتەوە، زەکات بۆ هاتنەدەرە لە ژێر ڕکێفی خۆشویستن و ئەلقە لەگوێی ماددییەت هەڵگەڕانەوەی بۆسەرخستنی مەردووم بەسەر ماڵ  وماددەیە، بابای موسڵمان دەڵێ هەر ماددە نییە مەردی دین ودونیاو دوارۆژین، زەکات وا لەمرۆڤ دەکات لەچاو تەنگی و چرووکی بیگۆڕێ بۆ دەستکراوەیی وبەخشندەیی، لە ئەنانیەت وخۆویستی بۆ خەڵك ویستی، دیارە کەژیانی دونیا بەئادەمیزادان سپێراوە تا ئاوەدانی بکەنەوە بەوەی کە دەستبارگری یەکدی بن مرۆڤ نابێ هەر خۆی بوێ و شتان بەخۆی ڕەواببینێ و بۆ خەڵکانیش هیچ، زەکات سامانەکەت پاکدەکاتەوە بەوەی کە بەشی هەژارو نەداربدەیت، زەکات بەش ومافی خەڵکی پێوەیە، دیارە پاك نابێتەوە تا ئەم





بەشەی لێ نەکەیتەوە، زەکات گەرچی لە ڕواڵەت کەمبوونی سامانە بەڵام بەپێچەوانەوە زیادبوون و زیاتر لەوەی داویەتی بەهەژاران دێتەوە دەستی.

**پرسیار: وشەی زەکات یانی چی؟**

وەڵام: واتە: (طهُر، نما و زاد، صَلُح) پاکی و چاکی وگەشەکردن.

**پرسیار: زەکات لەئیسلام یانی چی؟**

وەڵام: بریتیە لەوەی موسڵمان ئەندازەیەك لەماڵی خۆی بداتە موسڵمانێکی تر.

**پرسیار: یانی زەکات بەهەموو کەسێ دەشێت؟**

وەڵام: نەخێر، دەبێ ئەو کەسە ئیسلام بێت، کەواتە کافرو بێ باوەڕ زەکاتی پێنادرێ.

**پرسیار: زەکات لەچ ساڵ ومانگێك واجب کرا؟**

وەڵام: لەساڵی دووەمی کۆچیدا، لەمانگی شەوال.

**پرسیار: زەکات لەچیدا واجب دەبێت؟**

وەڵام: لە: **ئاژەڵ**، بۆ وێنە: وشتر، مانگاو گامێش، مەڕوبزن...**پارەو پوول**، بۆ وێنە: زێڕ وزیو...**دەغڵ ودان**، بۆ وێنە: گەنم وجۆ...**میوە**، بۆ وێنە: خورما وترێ..**کەل وپەلی بازرگانی.**

**پرسیار: ئەو چینانە کێن کە زەکاتیان پێ دەدرێ؟**





وەڵام: هەشت جۆرە کەسن، وەك لە قورئانی قسەلەجێ هاتووە:

**١-الفقراء:** هەژاران... هەژار کەسێکە ئەوەندە ماڵی نەبێ وکارێکی وەهای پێنەکرێ، کە جێگەی نیوەی پێویستیەکانی بۆپڕبکاتەوە.

**٢-المساکن:** نەداران... نەدار: کەسێکە ماڵی هەبێ، یان بتوانێ کارێکی وەها بکات کە جێگەی پێویستیەکانی ژیانی لەنیوەی زیاتر بۆ پڕبکاتەوە.

**٣-العاملین علیها:** کارەبەدەستان وکۆکەرەوانی... ئەو کرێکارو کاربەدەستانەن کەلەلایەن دەوڵەتەوە تەرخان دەکرێن بۆ کۆکردنەوەی زەکات ومشوور لێ خواردنی وتەسلیم بەخەزێنەی دەوڵەت کردنی ودابەشکردنی.

**٤-المؤلفة قلوبهم:** دڵڕاگیراوان... ئەو کەسەیە کە تازە موسڵمان بووەو نیازی بێ هێزە، یان بەهێزە بەڵام خاوەنی پلەو خزم ودۆستە، ئەگەر بەزەکات پێدانی ڕێزی لێ بندرێ، کەسانی تریش چاوی لێدەکەن وموسڵمان دەبن.

**٥-وفی الرقاب:** کۆیلەو ژێردەستەکان... ئەو کۆیلەیە گەورەکەی پێی دەڵێ: ئەگەر ئەوەندە پارەیەم بۆبێنی ئازادت دەکەم، ئەوەش بەئەندازەی پێویستی زەکاتی ئەدرێتێ، یان ئەو کۆیلانە دەگرێتەوە





كە ڕاستەوخۆ بەپارەی زەكات دەكڕدرێن و ئازاد دەكرێن.

٦-الغارمین: قەرزداران... ئەو كەسەیە بۆ كاروباری خۆی تووشی قەرزداری بووبێت و توانای دانەوەی قەرزەكەی نەبێ.

٧-فی سبیل الله: لەڕێی خودا... جەنگاوەرانی ڕێگەی خوا ئەو كەسانەی بەبێ موچە لەڕێگەی خوا جەنگ دەكەن، ئەوانەش بەئەندازەی ئەركی خواردن وجل وبەرگی خۆیان ومناڵیان تا ئەگەڕێنەوە، هەروەها بۆكڕینی چەك وتەقەمەنیش زەكاتیان ئەدرێتێ، هەر چەندە دەوڵەمەندیش بن.

٨-ابن سبیل: ڕێبوار... كەسێكە كەڕێبواروئاوارەیەو پارەو ماڵی پێ نەماوەو پەكی كەوتوە، هێندەی زەكات دەدرێتێ كە پێی بگاتەوە ماڵ و وڵاتی خۆی و لەو حاڵەتە نەدارییە كاتییە قوتاری ببێ.

**پرسیار: زەكات بەكێ بدرێ خێرترو چاكترە؟**

وەڵام: بە خزم و نزیكانی، چونكە پێغەمبەر دەفەرمووێ: {زەكات دان وخێركردن بەنەدار، هەر بە زەكات وخێركردن دادەنرێت، بەڵام زەكات دان وخێركردن بەكەسێك خاوەنی خزمایەتی بێت دووانە: زەكات دان وخێركردن وخزمایەتی كردنیشە}رواه احمد والترمذی



وابن ماجة.

**پرسیار: زەکاتی سەرفترە چیەو لەچ بەروارێکدا واجب کرا؟ ؟**

وەڵام: ئەو زەکاتەیە کەلە ئەنجامی تەواوکردنی گرتنی رۆژووی مانگی رەمەزان دا فەرز دەبێ، وە لەمانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچی فەرزکرا.

**پرسیار: سەرفترە کەی فەرز دەبێ؟**

وەڵام: زانایان لەسەر ئەوە رێککەوتوون کە لەکۆتایی مانگی رەمەزاندا فەرزدەبێ.

* * *






## ڕۆژووی مانگی رەمەزان

ڕۆژوو گرتنی مانگی رەمەزان یەکێکە لە پایە گرنگەکانی ئیسلام لە پاڵ هەر یەك لە نوێژ و زەکات و ڕۆژووش لەسەر موسڵمانان پێویست کراوە، لە دوانزە مانگی ساڵ تەنها مانگێ تەرخانکراوە ئەم مانگەش مانگێکی پیرۆزە کە مانگی رەمەزانە، مانگی رەمەزانیش بۆیە پیرۆزە چونکە قورئانی پیرۆز تیایە هاتۆتە خوارەوە، ئەم مانگە شەوێکی بەقەدرو پیرۆزی تێدایە کە بە" لیل القدر" ناسراوە، کە خواپەرستی لەم شەوە بە هەزار مانگە.

جا پێویستە بابای موسڵمان بەو شێوەیە بەڕۆژوو بێت کە خوای پەروەردگار داوای دەکات، وە ڕۆژوو زۆر سودو قازانجی بەکەڵکی هەیە و تەنزیم وڕێکخستنێك دەبەخشێ بەلاشە.

**پرسیار: ڕۆژوو یانی چی؟**

وەڵام: بریتیە لەخۆگرتنەوەی مرۆڤ بەنیازو مەبەستەوە لەخواردن وخواردنەوەو سەرجێیی وئاوی خۆهێنانەوەو خۆڕشاندنەوە، لە سپێدەی بەرەبەیانەوە هەتا بوولێڵی ئێوارێ!




**پرسیار: ڕۆژووی ڕەمەزان کەی فەرز کرا؟**

وەڵام: لەمانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچی.

**پرسیار: ڕۆژوو لەسەر کێ پێویستە؟**

وەڵام: لەسەر هەموو مرۆڤێ پێویستە، جگە لەمانە:

١- نەخۆش.

٢- پیری بێ توانا.

٣- ئافرەتی شیردەر.

٤-ئافرەتێکی سکپڕ = حاملە= .

٥- ڕێبوار.

٦- ئافرەتێك لە حەیزدابێ.

٧- ئافرەتێك لە زەیستاندابێت.

جگە لەمانە هەندێ حاڵەتی دیکە هەیە، کە بەپێی هەل ومەرج بڕیاری لەسەردەدرێ.

**پرسیار: جۆرەکانی ڕۆژوو چەندن؟**

وەڵام: دوو جۆرە، فەرز و سوننەت.

**پرسیار: ڕۆژووی فەرز چەند جۆرە؟**

وەڵام:

١- ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.



٢- ڕۆژووی کەفارەت، وەك: کـەفارەتی کوشـتنی هەڵـە، سـوێند شکاندن، شکاندنی ڕۆژووی ڕەمەزان بەجیماع، ظیهارکردن لەژن.

٣- ڕۆژوو لەخۆگرتن = صوم النذر = .

**پرسیار: ڕۆژووی سوننەت چەندە؟**

وەڵام: زۆر جۆرە بۆ وێنە:

١- شەش ڕۆژ لەمانگی شەوال.

٢- ڕۆژی عەرەفە.

٣- ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕڕەم = عاشوراء= .

٤- نۆ ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی = ذي الحجة = .

٥- زۆربـەی ڕۆژەکـانی مـانگی موحـەڕڕەم، چـونکە پێغەمبـەر دەفـەرموێ: {پەســەندترین ڕۆژوو دوای مــانگی ڕەمــەزان ڕۆژووی مــانگی موحەڕڕەمـــە، وە چـــاکترین نوێـــژیش دوای فـــەڕزەکان شەونوێژە} رواه مسلم واصحاب السنن و احمد والبيهقي.

٦- زۆربەی ڕۆژەکانی مانگی شەوال.

٧- مانگـە حەرامــەکان، کەبریتیــە: = ذوالقعـدة و ذوالحجـة و المحرم و رجب = .

٨- ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە لەهەفتەیەکدا.

٩- سێ ڕۆژ لەهەر مانگێك، واتە: (١٣ = ١٤ =١٥) ی هـەموو مانگێ.

١٠- رۆژێك نا رۆژێك.

**پرسیار: فەلسەفەو سودوکەڵکی بەرۆژوو بوون چییە؟**

وەڵام: بەکورتی لەسی خاڵان وەڵام دەدەینەوە وەك:

١- رۆژوو دڵی مرۆڤەکان نەرم دەکا، وانەی بەزەیی هاتنەوە بەهەژاران وکەم دەست وبرسیان فێردەبیت.

٢- یەکسانی لەنێوان دەوڵەمەندو هەژار، گەورەو بچووك دروست دەکات، چونکە هەموو وەك یەك برسی وتێنوون.

٣- کۆمەڵ فێری دەستووری نان خواردن دەبێت، بەم رەنگە هەموو لەیەك کاتدا رۆژوو دەشکێنن، وە لەیەك کاتدا پارشێو دەکەن وبەرۆژوو دەبن.

**پرسیار: ئاداب و ڕەوشتی ئیسلامی بۆ کەسی رۆژووەوان چین؟**

وەڵام: چەند شتێکن لە ڕۆژووی فەرز وسوننەت پیادەبکرێ باشە، بۆوێنە:

١- پارشێوکردن.

٢- پەلەکردن لەبەربانگکردنەوە.

٣- پاڕانەوەو دوعاکردن لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا.

٤- خۆپاراستن لەهەر خولیا و قسەو ڕەفتارێك کە خێری رۆژوەکە کەم دەکاتەوە.

٥- سیواکردن.

وانەی چواردەهەم

## حەج کر دنی ماڵی خوا

یەکێکە لەپایە گرنگەکانی ئیسلام، هەر کاتێ بابای موسڵمان تواناو لەش ساغ وسەروەت وسامانی چوون و هاتنی هەبێ ئەوە دەچێ بۆ شاری مەککە چەند کردارێکە ئەنجامدەدرێ لەمانگی ذی الحجة.

هەموو موسڵمانانی دنیا لە (كعبه الله) کۆدەبنەوەو دەوڵەمەندو هەژار و رەش وسپی وکوردو عارەب و تورك وفارس ئینگلیزی و...هتد، بەیەکسانی و بە یەکرەنگ، مرۆڤ تێدەگا بەراستی ئەمە کۆنگریەکی گشتی جیهانیە بەیەکەوە خواپەرستی دەکەن وئەم رێگەیە دەبرن سەروەت وسامان بەخت دەکەن لەپێناو رەزاو رەزامەندی خوای پەروەردگار.

**پرسیار: مەبەست لە حەج و عومرە یانی چی؟**

وەڵام: بریتیە لە سەردانی ماڵی خوا = كعبه الله = لەچەند پایەو فەرزو سوننەتێك پێکدێ.

**پرسیار: لەساڵێك چەند جار حەج ئەنجامدەدرێ؟**

وەڵام: لەساڵێك یەك جار.



**پرسیار: عومرە لەساڵێکدا چەند جار ئەنجامدەدرێ؟**

وەڵام: هەموو کاتێ، هەرکاتێ توانای چوونت هەبوو دەتوانی عومرە بەرپابکەی.

**پرسیار: جۆرەکانی حەج وعومرە چین؟**

وەڵام: تێکڕای زانایان یەکدەنگن کە جۆرەکانی حەج سێ جۆرە:

١- إفراد: ئەوەیە لە پێشدا ئیحرام بەحەج ببەسترێت، وکارەکانی حەج تەواوبکرێن، پاشان عومرەبکرێت.

٢- تمتع: ئەوەیە کە لەمانگەکانی حەجدا عومرە بکرێت، پاشان ئیحرام بشکێنرێ ودوایی دووبارە ئیحرام بەحەج ببەسترێ وحەجەکەش ئەنجام بدرێ.

٣- قران: ئەوەیە لەیەك کاتدا وێکڕا ئیحرام بەحەج وعومرە ببەسترێت وپێکەوە ئەنجام بدرێن.

**پرسیار: مەرجەکانی حەج وعومرە چین؟**

وەڵام: پێنجن:

١- موسڵمان بوون = الاسلام =.

٢- عاقڵ بوون = والعاقل=.

٣- بالغ بوون = والبلوغ =.

٤- ئازاد بوون =والحرية = .



٥- بۆلوان وبۆ گونجان = والاستطاعة = .

**پرسیار: حەج چۆن دەکرێ؟**

وەڵام: بە پانزە پایە:

١- ئیحرام بەستن.

٢-چوونە نێو شاری مەککە لە لای سەروییەوە، پاشان مزگەوتی حەرام ودوایی تەوافی چوونە مەککە = **طواف القدوم**=.

٣- شەو مانەوە = المبیت= لە مینا کە شەوی نۆیەمی ( ذی الحجة) یە.

٤- ڕاوەستان لە عەرەفات ( الوقوف بعرفات) کە لە ڕۆژی نۆیەم دایە.

٥- شەو مانەوە لە موزدەلیفە (المبیت بمزدلفة).

٦- بەرد تێفرێدانی سێ جەمرەکان ( رمي الجمرات الثلاث) کە لە ڕۆژی دەیەمی ( ذی الحجة) وە دەخایەنێ هەتا سێزدەیەمی.

٧- قوربانی سەربڕین پاش تێفرێدانی جەمرەی عەقەبە، کە پێشی دەگوترێ جەمرەی گەورە (الجمرة الکبری)، لە ڕۆژی دەیەمی ( ذی الحجة).

٨- سەری خۆتاشین یا کورت کردنەوەی پاش سەربڕینی قوربانی، هەر لە ڕۆژی دەیەمدا.



٩- تەوافی دەوری کابە (الطواف حول الكعبة) بە تەوافی پایە (طواف الركن) یان (طوف الأفاضة) ناودەبرێ.

١٠- هاتن وچوون (سعی) نێوان سەفاو مەڕوە.

١١- تەوافی خوا حافیزی (طواف الوداع) .

**پرسیار: عومرە چۆن دەکرێت؟**

وەڵام: عومرە چوار کردەوەی هەیە:

١- ئیحرام بەستن.

٢- تەواف کردن.

٣- هاتن وچوون لە نێوان سەفاو مەڕوە.

٤- سەری خۆتاشین.

*** ــــــ بەپشتیوانی خوای پەروەردگار کۆتایی هات ــــــ ***



# سوپاس و پێزانین

● لەناخەوە ڕێزو حورمەت و خۆشەویستی خۆم ئاراستەی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە بۆ لە چاپدانی ئەم نامیلکەیە یارمەتیاندام و، حەزم کرد ناویان بێنم بەڵام خۆیان ئامادەنەبوون بە بەیانکردنی ناویان، خوای پەروەردگار پاداشتی بەچاکە و خێریان بداتەوە و نموونەیان زۆرکات.

● سوپاسی ئەوانەی خوێندنەوەیان بۆ ئەم نامیلکەیەکردوە و بەسەرنج وتێبینیەکانیان ئەم بەرهەمەیان دەوڵەمەند کردوە.

● هەموو ئەوانەی هاندەرم بوونە، بۆ لەدایک بوونی ئەم بەرهەمە.



## ناوەرۆك



منداڵ ئەو توێژە دڵ پاک وناسک و بێ لەکەیە،
چۆن ئاڕاستەی وەرسوڕێنی ئاوا مەدار دەبێ،
چۆن نەخشاندنێ لەسینەی بنەخشێنی
سەرنجام شوێنەوارێ جێدەمێنێ و لەم سۆنگەوە دەتوانین بڵێین
ڕۆڵی دایک و باوک و مامۆستا و ژینگە و دەوروبەر کاریگەریەکی ئەتۆی دەبێ
بۆ پەروەردەو پێگەیاندنی،
جا دەبێ ئەو دایک وباوک و مامۆستایە زۆر هۆشیارانە و زیرەکانە
بنۆڕێ و کارو ڕەفتارێکی وەها ئەکات بەدەربێ لەهەر بنەمایەکی پەروەردەیی،
دواجار کەسایەتییەکی لاواز و بار بەسەر خەلک وکۆمەلکە بەرهەم بێت


بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر






چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر
نرخی 2000 دینارە